# مۆتەکە

## ئەنتۆن چیخۆف




- ناوی کتێب: مۆتەکە
- بابەت: چیرۆك
- نووسەر: ئەنتۆن چیخۆف
- وەرگێڕ: ئازاد نەجم
- مونتاژ: یانەی قەڵەم
- تیراژ: 500 دانە
- چاپ: یەکەم-سلێمانی 2013
- چاپخانە: یاد ، بازاڕی سۆز-نهۆمی سێیەم
- نرخ: 3000 دینار
- لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (2069)ی ساڵی 2013 پێ دراوە.

**ئەم وەرگێڕانەم**

**پێشکەشە بە ڕۆحی نەمریی**

**مامۆستای چیرۆکی کوردیی حەسەنی قزڵجی**

پێڕست

## ژنی خاوەن دەرمانخانەکە

شارە بچووکەکەی (ب) کە لە چەند کوچە و کۆڵانی خواروخێچ پێکهاتووە ڕۆچۆتە نێو خەوێکی قوڵەوە. لە نێو هەوایەکی مەنگ و پەنگخواردودا، بێدەنگی حوکمڕانە. تەنیا لە شوێنێکی دوور و لەوانەیە دەرەوەی شار بێت، سەگێك بە دەنگێکی تیژەوە کە بەئاستەم دەبیسترێ دەوەڕێ. هێندەی نەماوە سپێدە بدا.

چەندین دەمژمێرە هەموو شتەکان لە خەودان، تەنیا هاوسەرە گەنجەکەی (چیۆرنۆرمۆدیك) ی دەرمانساز نەبێ بێدارە و خەوی لێ ناکەوێ. گەرچی سێ جاران ڕاکشابوو بنوێ بەڵام ڕوون نەبوو بە چ هۆیەکەوە خەوی لێ نەدەکەوت. ئێستاش بە کراسی خەوێوە لەبەردەم پەنجەرە کراوەکەی ژووری نووستن دانیشتوە و چاوی بڕیوەتە کۆلانێ. هێندە هەست بە خەم و پەژارە و دڵتەنگیی دەکا - کە دیسانەوە ڕوون نییە بە چ هۆیەکەوەیە - حەز دەکا بگری. وەك ئەوەیە بەکرە و داوێك لە سینەیدا گیری خواردبێ و جارناجارێ خولێك بخوا و تا گەروی هەڵکشێتە سەرێ ... چیۆرنۆرمۆدیکی مێردیشی، لەپشت سەری ویەوە، چەند هەنگاوێك لەولاترەوە، ڕوی کردۆتە دیوارەکە و ڕۆچۆتە نێو خەوێکی شیرن و کردویەتیە پرخوهۆڕ. مێشولەیەکی تینوو و تامەزرۆ دەمە درێژەکەی چەقاندۆتە



بەشی سەرەوەی لوتی بەڵام چیۆرنۆرمۆدیك نەك هەست بە بوونی مێشولەکە ناکا بەڵکو زەردەی دێتێ. پێدەچێ خەون بەوەوە ببینێ کە تەواوی خەڵکی شار توشی کۆخە هاتون و پەیتا پەیتا و بێ پسانەوە دێنە دەرمانخانەکەی ئەو و شروبی دژەسەرمای لێ دەکڕن. ئیدی نە بە سرنج بێدار دەکرێتەوە نە بە تۆپ و نە بە ناز و نەوازش.

دەرمانخانەکە کەوتۆتە کۆتایی شارەوە، هەربۆیە ژنە، زۆربەی دەشتاییەکەی لێوە دیارە ... دەبینێ کە چۆن ئاسمان لەلای ڕۆژهەلاتەوە وردە وردە سپی هەڵدەگەڕێ و دواتریش پاش ماوەیەك، وەك ئەوەی ئاگرێکی گەورەی لێ هەڵگیرسابێ ڕەنگی ئەرخەوانی بەخۆوە دەگرێ. لەناکاو لەپشت بنچك و ڕوەکە قەد کورتەکانی **دەشتەکەوە** ڕوخساری گەورە و پانی مانگ دەردەکەوێ. سور هەڵگەڕاوە ( ڕون نییە بۆچی هەرکاتێ مانگ لەپشت بنەبنچکەکانەوە سەردەربێنی هەمیشە شەرمن دیارە ).

لەناکاو لەنێو بێدەنگی شەودا دەنگی پێ و دەنگی قسەکردن و جرینگەجرینگی مامزەی چەکمە، دێتە بەرگوێ. ژنی کابرای خاوەن دەرمانخانە دەکەوێتە بیرکردنەوە: (( ئەمانە ئەفسەرن و لەماڵی سەرۆکی پۆلیسەوە دەچنەوە بنکەکەیان)).

ساتێك دواتر دوو کەس کە فراکی سپییان لەبەردایە، وەدەردەکەون: یەکیان زل و قەڵەو، ئەوی تریان بچووکتر و باریکتر ... بە هەنگاوی ورد و سستەوە بەتەنیشت حەوشەکەدا دەچنە پێش و بەدەنگی بەرزەوە لەبارەی بابەتێکەوە دەدوێن. کاتێك دەگەنە بەردەم دەرمانخانەکە، هەنگاوەکانیان خاو دەکەنەوە و چاو دەبڕنە پەنجەرەکان. ئەفسەرە لاوازەکە دەڵێ:

- بۆنی دەرمانخانە دێ ... بەڵێ خۆیەتی! ئەها، بیرم کەوتەوە ... هەفتەی ڕابردو بۆ کڕینی ڕۆنگەرچەك هاتمە ئێرە ... کابرای خاوەن دەرمانخانە سەروچاوێکی

ترشاو و دەموقەپۆزێکی ولاٚغانەی هەیە. چەناگەی، ئەها! بەم شێوەیەیە! وەك (سامسۆن ) ، ئەوییش بەو چەناگەیەوە کەوتبووە گیانی کەسانی سەر بە نەتەوەی فەلەستیا.

کابرای قەڵەو بە دەنگێکی گڕەوە وەلاٚمی دەداتەوە:

- بەڵێ گیانەکەم ... دەرمانساز لەخەو دایە! پێناچێ ژنەکەشی بێدار بێ. دەزانی ئابتیوسۆڤ ئەو دەرمانسازە ژنێکی زۆر نازداری هەیە.

- بینیبیومە ... بەدڵمە ... دکتۆر، ئەرێ دەکرێ ئەو ژنە ناسك و نازدارە ئەو پیاوە دەموقەپۆز ولاٚغئاسایەی خۆش بووێ؟

دکتۆر بەشێوەیەك ئاە هەڵدەکێشێ وەك ئەوەی دڵی بۆ حاڵی کابرای دەرمانساز بووبێتە خەڵوز و دەڵێ:

- نا، پێناچێ خۆشی بووێت. ئێستا ئەو ژنە نازدارە لەپشت ئەو پەنجەرانەوە لەخەودایە! وانییە، ئابتیوسۆڤ؟ لەگەرمان داهەزاوە ... دەمی کردۆتەوە و قاچە بچووکەکانیشی بە لێواری چارپاکەدا شۆڕ بوونەتەوە. دەرمانسازی خەڵەفاویش قەدری ئەم ناسکۆڵەیە نازانێ ... پێدەچێ لە ڕوانگەی ویەوە ژنێك و بتڵێك ئەسیدفنیك هیچ جیاوازیەکیان نەبێ!

ئەفسەریش هاوشانی دکتۆر ڕادەوستێ و دەڵێ:

- دەزانی چی دکتۆر، واباشە بچینە ژوورێ و شتێك بکڕین! کێ دەڵێ ژنەکەی نابینین!

- چی تێدایە؟ دەرمانخانە ناچارە شەوانەش دەرمان بفرۆشێ. فەرموو با بچین!

- لەوانەیە ...

ژنی کابرای خاوەن دەرمانخانە، خۆی لە پشت پەردەکەوە دەشارێتەوە و دەنگێکی لەسەرخۆی زەنگی دەرگا دەبیستێ. دواتر سەیرێکی مێردەکەی دەکا کە هێشتا



بزەی بە لێوانەوە دیارە و پرخە پرخێتی ، بەپەلە کراسەکەی لەبەر دەکا، قاچە بێ گۆرەویەکەی لە پێلاٚوەکانی هەڵدەکێشێ و دەچێتە دەرمانخانەکە.

لەودیو دەرگا شوشەبەندەکەوە دوو کەس ڕاوەستاون ... فتیلەی چراکە هەندێك هەڵدەکێشێ، بەرەو دەرگاکە دەچێ بیکاتەوە و لەم حاڵەشدا ئیدی هیچ هەست بە خەم و هەناسەتوندی ناکا و گریانیشی نایەت، تەنیا هەندێك دڵی بە خێرایی لێدەدا. دکتۆرە قەڵەوەکە و ئابتیوسۆڤی لاواز وەژور دەکەون. دکتۆری تەنگەزل و گەنمڕەنگ و ڕیشهاتوو، جوڵەکانی ئارامن. لە هەموو جولاٚنێکی کەمیدا دەنگێکی وەك دڕان و هەڵتلیشان لە فەرەنجەکەیەوە دێ، ئارەقە بە تەواوی ڕوخساری داپۆشییوە. بەلاٚم ئەفسەرەکەی هاوڕێی کە ڕوخساری نەختێك سورە و بێ سمێڵە، چەشنی ژنان پاك و وەك شولێك شایستەی چەمانەوەیە. ژنی خاوەن دەرمانخانەکە کە دەستێکی خستۆتە سەر یەخەی کراسەکەی، دەپرسێ:

- چیتان دەوێ؟

- زەحمەت نەبێ ... هم ... بایی پانزە کۆبیك حەبی نەعنایی‌یم دەدەیتێ؟

ژنە بێ ئەوەی هیچ پەلەپەلێك بکا لەسەر تاقچەکە شوشەیەك هەڵدەگرێ و دەست دەکا بە کێشانیان. کڕیارەکانیش بێ ئەوەی چاو بترووکێنن چاویان بڕیوەتە کەفەڵی ژنە. دکتۆر چەشنی پشیلەیەکی تێر چاوەکانی بچووك دەکاتەوە بەلاٚم ئەفسەرەکەی هاوڕێی قیافەیەکی جدی هەیە. دکتۆر دەڵێ:

- تا ئێستا نەمدیوە خانمێك لە دەرمانخانەدا دەرمان بفرۆشێ.

ژنە بە تیلەچاوێك دەڕوانێتە ئابتیوسۆڤ و وەلاٚم دەداتەوە:

- ئەمە هیچ شتێکی سەیری تێدا نییە ... مێردەکەم کەسی لەگەڵدا نییە یارمەتی بدات، بۆیە خۆم یارمەتی دەدەم.

- ئەها! ئاوا ... دەرمانخانەیەکی زۆر جوانتان هەیە! ئەو هەموو شوشە بچووکە پڕ دەرمانانە! پێم بڵێ ناترسێی ڕۆژانە سەروکارت لەگەڵ ئەو هەموو ژەهرەدا هەیە؟

ژنە، حەبەکان دەخاتە پاکەتێکی بچووکەوە و دەیداتە دەستی دکتۆر. ئابتیوسۆڤ پانزە کۆبیکییەك بۆ ژنە درێژ دەکات. چەندین چرکە بە بێدەنگی ڕادەبرێ ... پیاوەکان دەڕواننە ڕوخساری یەکتر، هەنگاوێك بەرەو لای دەرگاکە دەڕۆن، دیسانەوە لەیەکتر دەڕواننەوە و دکتۆر ڕوو بە ژنە دەڵێ:

- زەحمەت نەبێ بایی پانزە کۆبیك سۆدام بدەرێ.

ژنە، دیسانەوە بە سستی لەسەرخۆییەوە دەست بەرەو لای ڕەفتەکە درێژ دەکا.

ئابتیوسۆڤ لە حاڵێکدا کە پەنجەکانی دەجوڵێنێ لەژێر لێوەوە دەپرسێ:

- ڕاستیەکەی دەبێ شتێکتان لا ... نازانم چ بڵێم ... شتێك دەزانی ، جۆرێك لە پاککەرەوە ... بۆ نموونە ئاوی کانزاییتان نییە؟ بەڵێ ئاوی کانزایی!

- بۆچی هەمانە.

- براڤۆ! بەخوا تۆ فریشتەی نەك ژن. تکایە سێ بتڵمان بۆ بێنە.

ژنە بەپەلە پاکەتێك سۆدا هەڵدەپچڕێ و لە تاریکایی شەودا، لە پشت دەرگاکەوە لە چاوان ون دەبێ. دکتۆر لە کاتێکدا کە چاوەکانی هەڵدەتەکێنێ، دەڵێ:

- ناسکۆڵەیە! ئابتیوسۆڤ، بەخوا ئاناناسێکی لەمشێوەیە لە دوورگەی (مادێرا) ش وەگیر ناکەوێ توخوا وانییە؟ تۆ پێت چۆنە؟ بەلاَم ... ئەرێ گوێت لە پرخەپرخ نییە؟ ئەمە کاکی دەرمانسازە حەزی نووستنی بزوتووە.

خولەکێك دواتر ژنە دەگەڕێتەوە و پێنج ئاوسۆدا دەخاتە سەر مێزەکە. ژنە، کە چەند ساتێك لەوەپێش لە ژێرزەمینەکە بووە هەربۆیە هەندێك ڕوخساری سوور هەڵگەڕاوە و تا ڕادەیەکیش شۆڕوشەوقی پێوە دیارە.



کاتێ ژنە سەری بتڵەکان دەکاتەوە کلیلی کردنەوەکەی لەدەست دەکەوێتە خوارێ. ئابتیوسۆڤ دەڵێ:

- لەسەرخۆ! ... هێواشتر! دەنگەدەنگ دروست مەکە با مێردەکەت لەخەو هەڵنەستێ.

- جا چی تێدایە! هەڵدەستێ با هەستێ!

- ئاخر لە شیرنی خەودایە ... خەون بە تۆوە دەبینێ ... بە سلاَمەتیی تۆوە!

دکتۆر بەو دەنگە گڕەیەوە لە حاڵێکدا کە دوای خواردنەوەی ئاوە گازدارەکە قرپی دێتەوە، دەڵێ:

- لەوە گەڕێ کە هەر مێردەوە و بەسەرهاتێکی هێندە خەمبارە کە واباشترە هەمیشە بنوێ. پێتوانییە خواردنەوەی ئەم ئاوە گازدارە هەندێك شەرابیشی پێویستە!

ژنە پێدەکەنێ و دەڵێ:

- قسەی سەیر دەکەن!

- چی تێدایە! بەداخەوە کە لە دەرمانخانەکان شەراب نافرۆشن! ... بەلاَم ... بەلاَم دەبووایە ئێوە وەك دەرمان شەرابییشتان هەبووایە، وانییە؟ ئەرێ شەرابی سوری فەڕەنسیتان لا نییە؟

- بەڵێ هەمانە.

- بەخوا شتێکی نایابە! بۆمان بێنە! نەفرەتی خوای لێدا، بیهێنە!

- چەندتان دەوێ؟

- ئەوەندەی کە پێویستە. سەرەتا بە ئەندازەی یەك ئۆنس لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بکە، دوای ئەوەی کە ئەوەمان خواردەوە، ئەوسا بڕیاری لێ دەدەین ... ئابتیوسۆڤ، تۆ پێت چۆنە؟ سەرەتا بە ئاوەوە و دواتریش بە خەستوخۆڵی ...

دکتۆر و ئابتیوسۆڤ لەبەردەم مێزەکە دادەنیشن و کلاوەکانیان لەسەریان دێننە خوارێ و دەکەونە خواردنەوەی شەرابی سوور. دکتۆر دەڵێ:
- بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنێی کە شەرابێکی زۆر خراپتان هەیە! بەواتایەکی تر (vinum plochissimum *)! بەڵام لە خزمەت ... هەم ... خاتونێکی وەك بەڕێزتدا وەك ئاوی حەیات وایە! تۆ مرۆڤ شێت و شەیدا دەکەی! بەندە لە دونیای ... لە دونیای خەیاڵ دا دەستەکانت ماچ دەکەم.
ئابتیوسۆڤیش دەڵێ:
- ئامادەم گیانم لەپێناو دا دابنێم و بە کردەوە بیکەم نەك بە خەیاڵ. بەشەرەفم سوێم لە ژیانی خۆشم نییە!
ڕوخساری خانمی چیۆرنۆرمۆدیك سوور هەڵدەگەڕێ، قیافەیەکی جدییانە بەخۆوە دەگرێ و دەڵێ:
- واباشترە واز لەم قسانە بێنن ...
دکتۆر بە حاڵەتێکی شەیتانانە تیلەچاوێکی دەداتێ، بە ڕوخسار پێدەکەنێ و دەڵێ:
- تۆ زۆر نازفرۆش و بە عیشوەی! چاوەکانت بە دوو تفەنگ دەچن لە حاڵەتی دەسرێژدا. تاق! تاق! پیرۆزبابییت لێ دەکەم: تۆ سەرکەوتیت! ئێمە دۆڕاین!
ژنە دەڕوانێتە ڕوخساری سورهەڵگەڕاویان، گوێ لە قسە هەڵیتوپەڵیتەکانیان دەگرێ و زۆر زوو لەگەڵیاندا دەکەوێتە قسە، دەداتە قاقای پێکەنین، ناز و عیشوە دەکا، تەنانەت دوای تکا و پێداگری ئەوان، نزیکەی دو ئۆنس شەرابی سووریشیان لەگەڵدا نۆش دەکا و دەڵێ:
- واباشە ئێوەی ئەفسەران زوو زوو لە بنکەکەتانەوە بێنە ناوشار گەرنا خەم و خەفەتی ئێرە خەڵك دەکوژێ. من لە خەفەتان خەریکە دیق دەکەم.



- ڕوونە! ئەناناسێکی وەك تۆ ... موعجیزەی سروشت و ئەم شوێنە ناخۆش و دورەدەستە! یادی بەخێر
(گریبادۆڤ *) کە دەیگوت: ((بە شوێنە دورەدەست و تەریکەکان! بە ساراتۆڤ! *)). دەی دەبێ بڕۆین، خۆشحاڵ بووم بە ناسینت ... زۆر خۆشحاڵ بووم! حیسابەکەمان کردی چەند؟
ژنە چاوەکانی دەبڕێتە ساپیتەی ژوورەکە، ماوەیەکی زۆر دەمی دەجوڵێنی و پاشان دەڵێ:
- دوانزە ڕۆبڵ و چلوهەشت کۆبیك.
ئابتیوسۆڤ کیسەباخەڵێکی بچووك لە گیرفانی دەردێنێ، ماوەیەکی درێژ پارەکە لەنێو کیسەباخەڵەکەدا دێنی و دەبا، سەرەنجام دوانزە ڕۆبڵ و چلوهەشت کۆبیکی حیسابەکە دەدات و لەحاڵێکدا کە بە نیشانەی خواحافیزی دەستی بۆ لای ژنە درێژ دەکا، بە مینگەمینگێکەوە دەڵێ:
- مێردەکەت لە شێرن خەودایە ... خەون بە تۆوە دەبینێ ...
- من حەزم بە قسەی گەمژانە نییە ...
- کوێی ئەم قسەیە گەمژانەیە؟ بەپێچەوانەوە ... هیچ گەمژانە نییە ... تەنانەت شکسپیریش گوتویەتی: ((خۆشبەحاڵی ئەوەی لە لاویدا لاوە*))
- دەستم بەردە!
سەرەنجام کڕیارەکان دوای قسەکردنێکی زۆر، دەستی ژنە ماچ دەکەن و بە دودڵییەوە، وەك ئەوەی شتێکیان لەبیرچووبێت لە دەرمانخانەکە دەچنە دەرێ.
ژنەش بەپەلە دەچێتەوە بۆ ژووری نووستن و لەبەردەم هەمان پەنجەرە دادەنیشێتەوە. دکتۆر و ئەفسەرەکە دەبینێ کە چۆن هەرکە لە دەرمانخانەکە دەچنە دەرێ، نزیکەی بیست هەنگاوێك بەوپەڕی بێ مەیلییەوە هەنگاو دەنێن، پاشان ڕادەوەستن و لەبارەی شتێکەوە دەکەونە سرتەسرت. دەبێ لەبارەی چیەوە

بدوێن؟ دڵی ژنە دەکەوێتە تەپەتەپ - بەڵام خۆیشی لە هۆکاری ئەمە تێناگا ... بەشێوەیەك دڵی لێدەدا وەك ئەوەی سرتە و چرپەی نێوان ئەو دوو پیاوە، پەیوەندی بە مان و ژیانی ویەوە هەبێ.

نزیکەی پێنج خولەکێك دواتر، دکتۆر لە ئابتیوسۆڤ جیا دەبێتەوە و ملی ڕێگای خۆی دەگرێ. بەڵام ئابتیوسۆڤ دیسانەوە دەگەڕێتەوە و یەك دوو جاران بەبەردەم دەرمانخانەکەدا تێدەپەڕێ ... جار جار لەبەردەم دەرگای دەرمانخانەکە ڕادەوەستێ و جاری واشە دەست بە هاتوچۆ دەکاتەوە ... سەرەنجام بە وریاییەوە لە زەنگی دەرگا دەدا.

ژنە لەناکاو گوێی لە دەنگی مێردەکەی دەبێ کە دەڵێ:

- چ خەبەرە؟ ئەوە زەنگ لێدەدەن و تۆش گوێت لە هیچ نییە! ئەم بێسەرەو بەرەییە چیە!

ئەمە دەڵێ و لە جێگاکەی دێتەدەرێ و خۆی لەبەر دەکا و بە خەواڵوویی و لەتردانەوە دەچێتە دەرمانخانەکە و لە ئابتیوسۆڤ دەپرسێ:

- چیت دەویست؟

- تکایە ... تکایە بایی پانزە کۆبیك حەبی نەعنایيم بدەرێ.

کابرای دەرمانساز بە خاوەخاو و باوێشکدان و خەواڵووییەوە لە کاتێکدا کە چۆکەکانی لە مێزەکە دەدا، لە سەروی ڕەفتەکەوە شوشەیەکی پڕ هەڵدەگرێ.

نزیکەی دوو خولەك دواتر، ژنی خاوەن دەرمانخانەکە ئابتیوسۆڤ دەبینێ لە دەرمانخانەکە دەچێتە دەرێ و دوای بڕینی چەند هەنگاوێك پاکەتە حەبە نەعنایيەکە توڕ هەڵدەداتە ناو تۆز و خۆڵی جادەکە. دکتۆر لەگۆشەیەکی حەوشەکەوە دەردەکەوێ و بەرەو لای ئابتیوسۆڤ دەچێ ... هەردوکیان یەك دەگرنەوە و بەدەم قۆڵبادان و قسەکردنەوە لەنێو تەمومژی ئەو بەیانییەدا ون دەبن. ژنی خاوەن دەرمانخانەکە بەچاوی ڕقەوە ڕوو لە مێردەکەی - کە ئێستا



هاتۆتەوە ژورێ و لیباسەکانی داناون و دیسانەوە ڕاکشاوەتەوە بنوێ - دەکا و دەڵێ:

- ئای کە بەدبەختم!

بەدەم فرمێسك ڕشتنەوە دوبارەی دەکاتەوە:

- زیاد لە ئەندازە بەدبەختم! و کەسیش ئاگای لە بەدبەختیم نییە ...

کابرای دەرمانساز بەتانییەکە لەخۆیەوە دەپێچێ و لەژێر لێوەوە بە پرتەوبۆڵەوە دەڵێ:

- پانزە کۆبیکم لەسەر مێزەکە لەبیرچووە. دوایی بیکەرەوە ناو چەکمەجەکە.

دوای ئەم قسەیە، دیسانەوە خەوی لێ دەکەوێتەوە.

(vinum plochissimum *) باش نییە. فەڕەنسیی

( گریبادۆڤ *) ئەلیکساندەر سێرگیۆڤیچ گریبادۆڤ 1798 - 1829 نوسەری ڕوسی. کە وەك وەزیر موختاری ڕوسیا کە لە ئێران خزمەتی دەکرد و بەهۆی کێشەیەکەوە کوژرا.

(( خۆشبەحاڵی ئەوەی لە لاویدا لاوە*)). ئەم دێڕە لە یەڤگینی ئۆنێگینی پۆشکین دا هاتوە نەك شکسپیر

# مـــؤ تــــة كـــة

کۆنین، ئەندامی هەمیشەیی کاروباری گوندییبیان، کە لاوێکی تەمەن سیساڵە بوو، لەدوای گەڕانەوەی لە پترۆسبۆرگەوە بۆ مولّکە تایبەتیەکەی خۆی لە (بۆریسۆڤۆ )، سوارێکی نارد بەدوای باوکی ڕۆحانیی (یاکۆڤ سیمیرینۆڤ) دا.
نزیکەی پێنج دەمژمێر دواتر سەروکەڵلەی باوکی ڕۆحانی پەیدابوو. کۆنین لە ڕاڕەوەکەدا پێشوازی لیّ کرد و گوتی:
- زۆر خۆشحاڵم بە ناسینتان، نزیکەی ساڵێك دەبیّ لێرە خزمەت دەکەم، پێدەچی کاتی ئەوە هاتییّ یەکتر بناسین، تکا دەکەم فەرموو وەرە ژوریّ!
ئەمەی گوت و بە سەرسوڕمانەوە لێی زیاد کرد:
- بەلاّم ... بەلاّم زۆر گەنجیت! تەمەنت چەندە؟
باوکی ڕۆحانی ئەو دەستەی کە بۆی درێژ کرابوو، بەنەرمیی گووشی و بیّ ئەوەی هۆکارێك لەگۆڕێدابیّ سور هەڵگەڕا و وەلاّمی دایەوە:
- بیستوهەشت ساڵم قوربان ...
کۆنین، میوانەکەی بەرەو ژووری کاری خۆی ڕێنمایی کرد و لەحاڵێکدا کە چاوی لەسەر هەڵنەدەگرت، کەوتە بیرکردنەوە: ((قیافەی چەند دزێوە و چەندە لە ژنە لادێییان دەچیّ!)).



لەڕاستیشدا سەروشکڵ و قیافەی باوکی ڕۆحانی وێکچوونێکی زۆری دەگەڵ ژنە لادێییبیان هەبوو: لوتێکی بۆ سەریّ هەڵگەڕاوە، گۆنای ڕەنگ ئەرخەوانی و چاوانی گەورە و شینی کاڵ و برۆیەلی باریك و بەئاستەم دیار و پرچی درێژ و کاڵ و وشك و ڕوونی بە شێوەی چلّی شۆڕەبی بەسەر شانەکانیدا هاتبوونە خواریّ. سمێڵیشی تازە دەهات شکڵ و شێوەی سمێڵی پیاوان بەخۆوە بگریّ، ڕیشە بچووکەکەشی لەو جۆرە ڕیشانەیە کە ڕوون نییە قوتابییە ئایینییەکان بە چ هۆیەکەوەیە نێویان لێناوە (بووهیمی). ڕیشی تەنکە و تیشکی خۆر بەسانایی بەنێویدا گوزەر دەکا، نە بە کەڵکی شانەکردن دیّ و نە بۆ ئەوەش دەبیّ دەستێکی پێدا بێنی، تەنیا بەکەڵکی ئەوە دێت موی لیّ هەڵکێشی ... هەمو ئەم نالەبارییانە لە سەروشکڵی دا، چەشنی چەند بنەبنچکی لەیەکتر دوور وەها دەقیان بە سەروشکڵییەوە گرتبوو کە ئەو چرکەساتەی  هەوڵی دەدا ئاڵوگۆڕ بەسەر ڕوخساریی خۆی دا بێنیّ و ڕۆڵی کەشیشێك بگێڕیّ، لە درێژەدان بە کارەکەی دوایان دەخست ... جبەیەکی کورتی قاوەیی تۆخی - کە پینەی گەورە بە هەردوو ئانیشکەکەیەوە دیاربوون - لەبەردابوو.
کۆنین، سەیرێکی داوێنی قوڕاویی کەشیشی کرد و بەخۆی گوت: ((مرۆڤێکی سەیر و سەمەرەیە ... یەکەم جاریەتی دێتە ماڵی من و بە خەیاڵیدا نەهاتووە جل و بەرگێکی خاوێنتر لەبەرکات)).
دواتر بەشێوەیەکی زۆر بێدەربەستانە لەحاڵێکدا کە کورسیەکی باشی لە مێزەکە نزیك دەکردەوە، گوتی: - فەرمو دانیشە، باوکە! تکادەکەم، فەرمووو!
باوکی ڕۆحانیی دەستی بۆ دەمی برد و کۆخەیەکی کرد، نەزانانە لەسەر لێواری کورسیەك دانیشت و دەستەکانی خستنە سەر چۆکەکانی. ئەم پیاوە ماندوە، ڕوخسار سوورهەڵگەڕاو و ئارەقاوییە، هەر لەگەڵ یەکەم سەرنجدا کاریگەریەکی خراپی لەسەر دەرونی کۆنین دانا. پێشتر هەرگیز لە ژیانیدا بەخەیاڵیدا نەهاتبوو

که لەوانەیە سەرزەمینی ڕوسیا لەم جۆرە کەشیشە پەرپووت و جێگای بەزەییانەی تێدا هەبن.
ئەو لە سەروسیمای باوکی ڕۆحانیی دا و لەو دەست خستنە سەر چۆکەی و لەو شێوازە دانیشتنەی سەر لێواری کورسییەیی دا، جۆرێك لە مەرایی و تەنانەت ناشایستەیی دەبینی.
کۆنین، لە حالێکدا کە پشتی بە کورسییەکەیەوە دەدا، دەستی بە قسان کرد:
- باوکە، تۆم بەهۆی کارێکەوە بانگێشت کردۆتە ئێرە ... داواکاریەکی باشم پێگەیشتوە و بەو هۆیەوە دەتوانم لە یەکێك لە دامەزراوەکاندا ببمە کەسێکی بەسود بۆ تۆ، کارەکە بەم شێوەیەیە: دوای ئەوەی لە پترۆسبۆرگ گەڕامەوە نامەیەکم لە سەر مێزەکە بینی کە لەلایەن سەرپەرشتیاری کلیسای ناوچەکەوە بۆم هاتبوو، تیایدا (دیمتری یۆڤیج) پێشنیاری پێ کردوم سەرپەرشتیی خوێندنگەی وابەستە بە کلیسا کە بڕیارە لە (سینکۆف) بیکەنەوە، بگرمە ئەستۆ. باوکەگیان من خۆشحالّم بەم کارە، لەناخی دڵەوە خۆشحالّم ... تەنانەت لەوەش زیاتر! بەوپەڕی شۆڕوشەوق و حەزەوە پێشنیارەکەی قبوولْ دەکەم!
لێرەدا لە جێگای خۆی هەستا و کەوتە پیاسە کردن بەنێو ژوورەکەدا و گووتی:
- هەلّبەت چ بەڕێز یگۆر دیمتریۆڤیج و چ بەڕێزیشت ئاگاتان لە باری دارایی من هەیە و دەزانن شتێکی ئەوتۆم لەبەردەستدا نییە ... مولّکەکەم لە گرێوی بانك دایە و جگە لەو موچەیەی کە لەپای ئەندامێتیم لە فەرمانگەی کاروباری گوندییان وەری دەگرم هیچ دەرامەتێکی ترم نییە، لەبەر ئەوە دەستم بەستراوە، بەلاّم بەلّێن دەدەم درێخیی نەکەم لە هەر کۆمەك و هاوکاریەك کە بە من بکرێت ... ئێستا فەرمو بلّێ کەی دەتەوێ دەسبەکار بیت و خوێندنگەکە بکەیتەوە؟
باوکی ڕۆحانیی یاکۆف وەلاّمی دایەوە:



- هەرکاتێ پارەم لە بەردەست دا بێت.
- ئایا ئێستا پارەت لە بەردەست دا نییە؟
- نەخێر ... دێهاتیەکان لە کۆبوونەوەی گشتی خۆیاندا گەیشتونەتە ئەو بڕیارەی سالاّنە لە هەر پیاوێك سی کۆبیك وەربگیرێ، بەلاّم ئەمە تەنیا بەلّێنێکە و هیچی تر! بۆ دەسبەکاربوون لە قۆناغی یەکەم دا لانیکەم پێویستمان بە دوسەد ڕۆبلّە.
کۆنین ئاهێکی هەلّکێشا و گووتی:
- هم ... لە ئێستادا بڕەپارەیەکی لەو شێوەیەم لەبەردەست دا نییە، لە درێژەی ئەو گەشتەم دا لە پترۆسبۆرگەوە بۆ ئێرە نەك تەنیا ئەوەی کە هەمبوو سەرفم کرد بگرە کەوتمە ژێر باری قەرزیشەوە، دەبێ دەست بنێینە دەستی یەك و کارێك بکەین.
ئەمەی گووت و کەوتە بیرکردنەوە. کەوتە باسی ئەو کارانەی کە دەبێ لە ئایندەدا بیانکات و لە سیما و ڕوخساری باوکی ڕۆحانیی دا بەدوای دۆزینەوەی نیشانەکانی پەسندکردن و هاوڕایی دا دەگەڕا.
بەلاّم ئەو ڕوخسارە مەندە، خالّی بوو لە پشتگیریی و جگە لە ترس و نیگەرانیی هیچ شتێکی تری تێدا بەدی نەدەکرا ...
ئەگەر سەرنجی درابایە، لەوانەبوو مرۆڤ وابزانێ کە کۆنین بە وشەگەل و دەستەواژەی فەرمی و کاربەڕێوەبەرییانە لەگەلّیدا دەدوێ و تێگەیشتن لە واتای ئەو قسانە لە توانای وی بەدەرە و هەرتەنیا لەڕوی ڕێز و نەزاکەتەوەیە کە گوێی بۆ شل کردووە. وە لەهەمان کاتیشدا دەترسێ هەستی پێ بکەن و ڕیسوا بێ.
کۆنین کەوتە بیرکردنەوە: ((ئای گەنجۆ، ڕوونە کە لە مرۆڤە زرینگ و زیرەکەکان نییە ...)).

تەنیا ئەو کاتەی کە خزمەتکارەکە بەخۆی و دو پەرداخ چای و دەفرێکی پڕ لە نانی شیرنەوە هاتە ژووریَ تا ڕادەیەك ڕوخساری باوکی ڕۆحانیی گەشایەوە و زەردەیەکی هاتە سەر لێوان، دواتر بێ ڕاوەستان پەرداخە چایەکەی خۆی هەڵگرت و کەوتە خواردنەوەی.

کۆنین بیروبۆچوونەکانی خۆی بەدەنگی بەرز دەردەبڕی و دەیگووت:

- چۆنە نامەیەك بۆ باوکی پیرۆز بنوسم؟ ئەوانن کە پێشنیاری بناتنانی خوێندنگەی وابەستە بەکلیسایان کردووە نەك ئێمە! ڕاستیەکەشی هەر ئەوەیە کە ئەرکی سەرشانی ئەوانە سەرچاوەی وەدەسهێنانی داراییمان نیشان بدەن. بیرمە لە شوێنێك دا خوێندمەوە بڕە پارەیەکیان بۆ ئەم کارە تەرخان کردبوو، ئایا لەم بارەیەوە هیچ زانیاریەکت لە لا نییە؟

باوکی ڕۆحانیی بە چەشنێك سەرگەرمی خواردنەوەی چایەکەی بوو کە نەیتوانی دەسبەجێ وەڵامی پرسیارەکەی کۆنین بداتەوە، نیگای چاوە شینە کاڵەکانی بەسەر کۆنین دا خزاند، ساتێك چاوەڕوان مایەوە، دواتر وەك ئەوەی تازە پرسیارەکەی ئەوی بیر کەوتبێتەوە، سەرێکی بەنیشانەی نەخێر لەقاند.

چێژ و ئیشتیهایەکی ئاسایی و لە هەمان کاتدا نادروست، بە ڕوخسارە ناحەزەکەیەوە نەخشی بەستبوو. باوکی ڕۆحانیی سەرگەرمی هەڵقوڕاندنی چایەکەی بوو، هەر فڕێك کە لێی دەدا چێژێکی تەواوی لێ وەردەگرت. هەرکە چایەکەی تا دوایین دڵۆپ خواردەوە پەرداخەکەی دانایە سەر مێزەکە، جارێکی تر هەڵیگرتەوە و سەیرێکی ناوی کرد و دیسانەوە داینایەوە. لەم ساتەدا نمای چێژ و لەزەت بە ڕوخساریەوە ون بوو و نەما ...

دواتر کۆنین بینی کە میوانەکەی نانێکی شیرنی لە دەفرەکەدا هەڵگرت، قەپێکی بچووکی لێدا، ماوەیەك لە نێو پەنجەکانیدا هێنای و بردی و دواتر خێرا پەستایە گیرفانییەوە.



کۆنین لە حاڵێکدا کە بەبینینی ئەم کارەی باوکی ڕۆحانیی شانەکانی بەنیشانەی قێزکردنەوە هەڵدەتەکاند، کەوتە بیرکردنەوە: ((ئیدی ئەم چەشنە کردارانە هیچ جۆرە وێکچوونێکیان دەگەڵ ڕەفتاری کەشیشان نییە! دەبێ ئەمە چ نێوێکی لێ بنرێ! هەڵپە و چاوبرسێتی کەشیشێك! یان ڕەفتارێکی مندالآنە؟)).

وە دواتر کاتێك دەرفەتی ئەوەی بۆ کەشیش ڕەخساند پەرداخە چایەکی تر بخواتەوە، تا ڕاڕەوەکە بەڕێی کرد و پاشان لەسەر کاناپەپەکی بچووك ڕاکشا و بە تەواوی خۆی دایە دەست هەستێکی ناخۆشەوە کە بەهۆی بینینی باوکی ڕۆحانییەوە بۆی هاتبووە پێش.

کەوتە بیرکردنەوە: (( چ مرۆڤێکی کێویی و سەیرە! پیس و پەڵۆس و شەپڕێو و گەمژە و لەوانەشە ئالودەی مەیخواردنەوە بێت... ئەی هاوار خوایە! مرۆڤی لەم چەشنە دەبێتە باوکی رۆحانیی! دەبێتە شوان و ڕێنیشاندەری جەماوەر! دەتوانم لە مێشکی خۆمدا وێنای بکەم کە لە دەنگی شماسێکدا کە هەموو نوێژی نیوەڕۆیان دوابەدوای ئەو دەڕوات و بانگی دەکات: (ئەی باوکی ڕۆحانیی نزای خێرمان بۆ بکە!). ئەی باوکە باشەکە! ئەی ئەو باوکەی یەك گەردیلە کەسایەتیت نییە! ئەو باوکەی کە ڕەفتارت نادروستە و چەشنی منداڵی شەش حەوت ساڵان نانی شیرن دەدزیت ... تف! نازانم ئەو ئەسقەفەی کە ئەرکی کەشیشێتی بەم پیاوە سپاردوە لەو کاتەدا هۆشی لەکوێ بووە؟ ئەو ئەسقەفانەی ئەرکی کەشیشیی بەم چەشنە پیاوانە دەسپێرن، دەبێ خەڵك بە چی بزانن؟ لێرە پێویستمان بە پیاوانێکە کە ...)).

لێرەدا کۆنین کەوتە فکری ئەوەی کە دەبێ کەشیشانی ڕوس خاوەن چ خەسڵەتێك بن و چ تایبەتمەندییەکیان تێدابێ ...

((بۆ نموونە ئەگەر من کەشیش بام ... ئەو کەشیشانەی زرینگن و عاشقی کارەکەی خۆیانن زۆر شتیان پێ دەکرێت ... ئەگەر وا بووایا ئێستا کێشەی ئەم خوێندنگەیەم لەکۆڵ ببۆوە. ئەدی وتاردان؟ ئەگەر کەشیش پاك و ڕاستگۆ و عاشقی کارەکەی خۆی بێت و بەهرەی لێ وەرگرێ، دەبێ چەندە وتاری بەجۆش و خرۆش و هەژێنەر بدا!)).
لێرەدا چاوەکانی داخست و بە خەیاڵ کەوتە وتاردان. خولەکێك دواتر چووە سەر مێزەکەی خۆی و دانیشت و بەخێرایی کەوتە نوسینی وتار و لەگەڵ خۆیدا کەوتە بیرکردنەوە: ((دەیدەمە ئەو لاوە موزەردە با لە کلیسا بیخوێنێتەوە ...)).
بەیانی ڕۆژی دواتر کۆنین چووە سینکۆف، تا کێشەی بنیاتنانی خوێندنگەکە ببڕێنێتەوە و لەو نێوەشدا لەگەڵ کلیسایەکدا، کە خۆی یەکێك بوو لە بەرپرسانی ناوچەکە و یەکێك بوو لەوانەی کە ڕاسپێردرابوو بۆ دامەزراندنی خوێندنگەکە، ببێتە ئاشنا. بە پێچەوانەی خراپی ڕێگاکەوە کە مرۆڤی ماندو و وەڕەز دەکرد، سپێدەیەکی یەکجار دڵگیر و خۆشی هەبوو. خۆر بە ئاسمانەوە دەدرەوشایەوە و بە گەرمایی تیشکەکەی توێژە بەفرەکانی سەرزەویەکەی - کە بێرە و بەوێوە مابوونەوە - دەبڕی و دەتواندەوە. بەفریش لە چرکەساتی ماڵاوایی کردن لە زەوی، وەك ئەوەی بپاڕێتەوە و تکا بکات، بریسکەی دەدایەوە و خۆی ڕەنگاوڕەنگ دەنواند کە چاو لە سەیرکردنی دەهاتە ژان و لە هەمان خاڵیشدا چووزەرەی گوڵ و گیاوگۆڵی پایزەش پەلەیان بوو هەرچی زووە سەریان لە ژێر خاك بێننە دەرێ. قەلەڕەشەکان بەشکۆیەکی زۆرەوە بە ئاسمانی ناوچەکەدا لە فڕیندا بوون. قەلەڕەشێك بەرەو زەوی داهاتەوە و بەرلەوەی بە تەواوی قاچەکانی بخاتە سەر زەوی چەندین جار لە ئاست شوێنێکدا بەرز و نزم بۆوە.
باڵەخانەی دارینی کلیسا کە کۆنین خەریکبوو لێی وەنزیك دەکەوت، پەڕپوت و داڕزیو و ڕەنگی خۆڵەمێشی بوو. پایە بچووکەکانی ئەملاوئەولای دەرگای



چوونەژوورەوەشی کە سەردەمانێك بە ڕەنگی سپی بۆیە کرابوون، درزیان بردبوو و لە دو ئاموری کەچە و دزێو دەچوون، تابلۆی سەر دەرگاکەشی جگە لە پەڵەیەکی تاریك، هیچی تری پێوە بەدی نەدەکرا.
ئەم هەمو وێرانیی و هەژارییە کۆنینی تەزاند. بە دڵشکاوییەوە چاوەکانی بڕینە زەویەکە و چووە نێو حەوشی کلیسا و لە بەر دەرگاکەدا ڕاوەستا. ڕێوڕەسمی نوێژکردن تازە دەستی پێکردبوو، شماسێکی پیر و قەمبوور بە دەنگێکی هێواش و گیراو و کەرخەوە نزای دەخوێند.
باوکی ڕۆحانیی یاکۆف، کە ڕێوڕەسمی نوێژکردنی بەبێ شماس بەڕێوەدەبرد، لە حەوشی کلیسادا بە بخورسوزێکەوە دەگەڕا و کندری دادەگیرساند و بۆنی خۆشی بڵاو دەکردەوە. ئەگەر هاتبا و کۆنین بەهۆی بینینی ئەو ڕەوشە نالەبارەوە باری دەرونیی تێك نەچووبا، ئەوا لەگەڵ بینینی باوکە یاکۆفدا دەیدایە تریقەی پێکەنین. کەشیشی کورتەباڵا جبیەکی لەبەن چنراوی کۆنی پڕ لە گنج ولۆچی لەبەردا بوو کە داوێنەکەی لە زەوی دەخشا.
دەکرا بڵێی تا ڕادەیەك کلیسا چۆڵ بوو. کۆنین کاتێ ڕوانییە خەڵکەکە بە بینینی دیمەنێك حەپەسا: ئەوانەی لەنێو کلیسادا بوون و سەرگەرمی بەڕێوەبردنی سروتە ئاینییەکانی خۆیان بوون، تەنیا پیر و منداڵ بوون ... ئەدی گەنجەکان لەکوێن؟ بەڵام دوای ئەوەی جارێکی تر بە وردی ڕوانییەوە ڕوخساریان، بۆی دەرکەوت گەنجن و ئەو بە پیریان تێگەیشتوە ... با جارێ واز لەم بابەتە بێنین، ئەم بە هەڵە دا چوونە چکۆلەیە گرینگییەکی ئەوتۆی نییە.
حاڵی نێو بیناکەش لە دەرەوەی باشتر نەبوو، لەسەر ئەو جێگایەی دیوارەکە کە تایبەت بوو بە هەڵواسینی شەمایلی قەدیسان و دیوارە ڕەنگ خورماییەکانی تریش، جێگای خاڵێکت بەرچاو نەدەکەوت بەهۆی دوکەڵی مۆمەوە ڕەش هەڵنەگەڕابێ و تێپەڕینی ڕۆژگار مۆری خۆی لێ نەدابێ. گەرچی پەنجەرەی زۆر

تێدابوون بەڵام سەرباری ئەوەش تاریك و لێڵ دەهاتە بەرچاوان و دەتگوت سەروەختی خۆرئاوابوونە.

کۆنین دەگەڵ خۆیدا لە فکر و بیرکردنەوەدا بوو: ((لێرەدا ئەو مرۆڤانەی کە ڕۆحیان پاکە بەوپەڕی ئاسودەییەوە نزا دەکەن ... شکۆ و گەورەیی کلیسای (سن پۆل) ی ڕۆما چۆن مرۆڤ سەراسیمە دەکا سادەیی ئەم کلیسایەش بە هەمان ئەندازە کاریگەری خۆی لەسەر مرۆڤ دادەنێ.

بەڵام هەرکە باوکی ڕۆحانیی هاتە سەر میحرابەکە و نوێژی نیوەڕۆی دابەستا، ئەو ئارەزوەی کە کۆنین بۆ نوێژکردن هەیبوو، بووە دوکەڵ و بەهەوادا چووو.

باوکی ڕۆحانی کە لە تەمەنی گەنجی دا لەسەر کورسی خوێندنەوە گەیشتبووە پلەی کەشیشیی هێشتا نەیتوانیبوو لە بەڕێوەبردنی نوێژەکاندا ببێتە خاوەن شێوازێکی تایبەت بەخۆی. کاتێ نزای دەخوێند دەتگوت ناتوانێ بڕیار بدات کە لەسەر کام یەك لە دەنگەکان ڕاوەستێ: لەسەر تینۆری نەرم یان باسی گڕ، نەزانانە کڕنۆشی دەبرد، بەپەلە دەهات و دەچووو و بە جوڵەیەکی خێرا پەردەی میحرابەکەی لادەدا و دایدەخستەوە ... شماسی پیر کە پێدەچوو نەخۆش و گوێ گران بێت، بە ئاستەم گوێی لە نزاکانی وی دەبوو، بۆیە جارجار لەیەکتر حاڵی نەبوونی بچووک ڕویان دەدا. بەرلەوەی باوکە یاکۆف نزای پێویست بخوێنێ شماس دەستی بە کاری خۆی دەکرد، یان باوکی ڕۆحانی کاری خۆی دەکرد کەچی شماسی پیر گوێچکەکانی بەرەو لای میحرابەکە قوت دەکردنەوە و گوێی هەڵدەخست و ئاگای لەخۆی نەدەما تا لەپڕ داوێنیان ڕادەکێشا و وەئاگایان دێنایەوە. دەنگی شماس - کە نەخۆشیی تەنگەنەفەسیی هەبوو - لەرزۆك و کەرخ بوو ... بۆ تەواو ناشیرنتر کردن و دزێوتر کردنی ئەم دیمەنە نەشازەش کوڕێژگەیەکی بچووك کە سەری لە پشت نەردەی میحرابەکەوە بە ئاستەم بەدی دەکرا شماسی لەگەڵ خۆیدا ڕادەکێشا. کوڕێژگە بە دەنگێکی بەرزی زیقنی



مندالأنەوە دەیخوێند و دەتگوت بریاری داوە هەرگیز لەگەڵ گروپەکەدا کۆك و هاوڕیتم نەبێت.

کۆنین چەند خولەکێك ڕاوەستا، بڕێك گوێی ڕاگرت و چووە دەرێ تا جگەرەیەك داگیرسێنێ. ئیدی نائومێد ببوو، بە نەفرەتەوە لە کلیسا ڕەنگ خۆڵەمێشیەکەی دەڕوانی.  بە دەم ئاه هەڵکێشانەوە کەوتە بیرکردنەوە: ((گلەیی لە نەمان و لاوازبوونی باوەڕی مەزهەبیی خەڵك دەکەن ... بۆچی نەیکەن! پێدەچێ چارەسەری کێشەکە ئەوەبێت تا دەتوانن و پێیان دەکرێ لەم جۆرە کەشیشانە بۆ ئێرە بنێرن )).

کۆنین تا دەمژێرێکی تر، دو سێ جاری تریش هاتە نێو حەوشی کلیسا و هەموو جارێکیش حەزی دەکرد بچێتەوە دەرێ، بچێتەوە نێو هەوای ئازاد. ئەو ڕۆژە تا کۆتایی هاتنی ڕێوڕەسمی نوێژ، لە کلیسا مایەوە و پاشان چووە دیداری باوکە یاکۆف لەماڵەکەی خۆیدا.

ڕووکەش و دیوی دەرەوەی خانوەکەی باوکی ڕۆحانیی، لە هیچ لایەنێکەوە جیاوازی دەگەڵ خانوەکانی تری گوندەکەدا نەبوو. تەنیا داروباری ساپیتەکەی نەبێ کە بڕێك ساف و لوستر بوو و سەرپەنجەرەکانیشی بە پەردەیەکی سپی کورت داپۆشرابوو.

باوکی ڕۆحانیی میوانەکەی بەرەو ژورێکی ڕووناك کە زەویەکەی سواق کرابوو و دیوارەکانیشی بە کاغەزیکی دیواریی هەرزانبەها ڕازێنرابۆوە، ڕێنمایی کرد. سەرباری هەوڵی ڕازاندنەوەی ژورەکەش وەك وێنەی لە چوارچێوە گیراو و کاتژمێرێکی ڕازێنراوە، کەچی هەژاریی کەلوپەلی ناوماڵ، مرۆڤی دەخستە سەرسوڕمانەوە.  هێندە بەسبوو مرۆڤ تیلەچاوێك بگرێتە مۆبێلەکان تا وا هەست بکات کە باوکی ڕۆحانیی ماڵ بە ماڵ گەڕاوە و هەر پارچە مۆبێڵەی لە شوێنێکەوە هێناوە، بۆ نموونە لە شوێنێك مێزێکیان دابێتێ کە تەنیا سێ دانە

پێچکەی هەبوون، لە شوێنێکی تر چارپایەکیان دابێتێ، لە شوێنێکی تر کورسیەکی بۆ پشتەوە شکاو و تەپیو، لە شوێنێکی تر کە پێدەچوو زۆر بەدەستودڵ بووبن شتێکی شێوە کاناپەیان - کە پشتییەکی تەخت و جێگا دانیشتنێکی شەترەنجیی هەبوو - دابێتێ. ڕەنگی ئەم شتە شێوە کاناپەیە، سورێکی چڵکن بوو و بۆن بۆیاخی لێ دەهات.

کۆنین سەرەتا ویستی لەسەر یەکێك لە کورسیەکان دانیشێ بەڵام برێك چاوەڕوان مایەوە و چوو لەسەر چارپاکە دانیشت.

باوکە یاکۆف لە حاڵێکدا کە کڵاوەکەی بە بزمارێکی ڕەش و درێژەوە هەڵدەواسی، پرسی: جاری یەکەمتە دێیتە پەرستگاکەمان؟!

- بەڵێ یەکەم جارمە. گوێبگرە باوکە ... بەرلەوەی لەبارەی بنیاتنانی خوێندنگەکەوە بدوێین پێیان بڵێ با پەرداخێك چامان بدەنێ ... نەك هەر گەرووم تەنانەت ڕۆحیشم وشك بووە ...

باوکە یاکۆف چەند جارێك پێڵووی چاوەکانی تروکاند، دەستی بۆ دەمی برد و کۆخەیەکی کرد و چووە پشت ئەو دیوارەی کە ژورەکەیان پێ کردبووە دو بەشەوە. دوای ڕۆیشتنی وی لەودیوەوە سرتە سرتێك هاتە بەرگوێیان .

کۆنین بیری کردەوە: ((خەریکی سرتەیە لەگەڵ ژنەکەی ... خراپ نییە مرۆڤ چاوێك بە قەد و باڵای ژنی ئەم کەشیشە موزەردە دا دا بگێڕێ ...)).

چەند خولەکێك دواتر باوکی ڕۆحانیی بە ڕوخسارێکی سورهەڵگەڕاو و ئارەقاوییەوە هاتەوە و لە حاڵێکدا کە هەوڵی دەدا زەردەخەنەیەك بێنێتە سەر لێوانی، لەسەر لێواری کاناپەیەك دانیشت و بێ ئەوەی سەیری ڕوخساری میوانەکەی بکات، گوتی:

- هەر ئێستا سەماوەرەکە دادەگیرسێنن.



کۆنین بەترسەوە بیری کردەوە: (( ئەی هاوار خوایە هێشتا سەماوەریشیان دانەگیرساندوە! دەبێ جارێ بۆ خۆم لێی دانیشم! )). دواتر ڕووی کردە باوکی ڕۆحانیی و گووتی:

- نامەیەکم لایە کە بۆ ئەسقەفم نووسیوە، دوای چاخواردنەوە بۆتی دەخوێنمەوە ... پێم باشە تۆش گوێت لێ بێت، بەڵکو تۆش شتێکت بەبیردا بێت و بتوانین لێی زیاد بکەین ...

- زۆر باشە.

ماوەی خولەکێك، بێدەنگی فەرمانڕەوای ژورەکە بوو.

باوکی ڕۆحانیی بەنیگایەکی تێکەڵ بە ترسەوە ڕوانییە ئەو دیوی دیوارەکە و قژی ڕێکخستەوە، ئاوی لوتی هەڵکێشایەوە و دواتر گووتی:

- کەش و هەوایەکی لە ئەندازە بەدەر خۆشی هەیە!

- ڕاست دەفەرموی ... خەریکبوو لە یادم بچێت بۆتی باس بکەم، دوێنێ بابەتێکی خۆشم خوێندەوە ... ئەنجومەنی شاری ڤۆڵسك بڕیاری داوە هەموو خوێندنگەکانی وابەستە بە ئەنجومەن بخاتە ژێر خاوەندارێتی ڕۆحانییەکانەوە ... ئیدی ئەمە لە کارە تایبەتییەکانە ...

کۆنین لە جێگای خۆی هەستا و بەنێو زەوی سواخکراوی ژوورەکەدا کەوتە پیاسەکردن و دەربڕینی بۆچوونەکانی خۆی. دەیگوت: هەڵبەتە ئەم بابەتە گرینگیەکی ئەوتۆی نییە بە مەرجێك ڕۆحانییەکان بە ڕوونی درك بە ئەرکەکانی خۆیان بکەن و سووربن لەسەر گەیاندنی پەیامەکانیان. بەداخەوە هەندێك کەشیش هەن و دەیانناسم کە لە بوواری گەشەی فیکریی و تایبەتمەندیە مەعنەوییەکانیانەوە هێندە لاوازن شایستەی ئەوەن بکرێنە کاتیی سوپا نەك کەشیش. ئەم قسەیەم لێ قبووڵکە کە زیانی مامۆستا بە قوتابخانە چەند جاران کەمترە لە زیانی کەشیش.

ئەمەی گووت و لە سەروسیمای باوکی ڕۆحانیی ورد بۆوە . ئەو، بە پشتێکی چەماوەی چەشنی کەمانەوە دانیشتبوو، بە قوڵیی بیری لە بابەتێك دەکردەوە و پێدەچوو ئەسڵەن گوێبیستی قسەکانی میوانەکەی نەبووبێ.
دەنگی ژنەکەی لەودیوو دیوارە نێوبڕەکەوە هاتە بەرگوێ: (یاشا[*]) تا ئێرە وەرە!
باوکی ڕۆحانیی ڕاچڵەکی و بەرەو ئەوێ ڕۆیشت. دیسانەوە دەنگی سرتەسرت هاتەوە بەرگوێیان. کۆنین کە زۆر بە پەلە بوو بۆ چایەکەی، سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد و بەخۆی گووت: ((پێناچێ لێرە پیاڵە چایەکم بدەنێ! وادیارە میوانێکی نەخوازراوم. ئەوەندە لوتف ناکا دوو قسەم لەگەڵدا بکا، تەنیا دانیشتوە و برژانگەکانی دەپروکێنێ)).
دواتر دەستی بۆ کڵاوەکەی برد و ماوەیەك لە چاوەڕوانی هاتنەوەی باوکی ڕۆحانیی دا مایەوە و پاشان ماڵاوایی لێ کرد و ڕۆیشت. بەدەم ڕێگاوە لەگەڵ خۆیدا دەدوا و دەیگووت: ((ئەم بەیانییەم بە بەلاش لێ تاڵ بوو! گەندەپیاو! لباد! چەند بەفری پارساڵ بەلای منەوە گرینگە کردنەوەی ئەم خوێندنگەیەش بۆ وی ئەوەندە. نا، مەحاڵە من و ئەو بەیەکەوە بتوانین چێشتێکیش ساز بکەین چ جای بنیاتنانی خوێندنگەیەك! ئەگەر سەرپەرشتیاری کلیسا دەیزانی چ کەشیشێك لێرە خزمەت دەکات قەت هێندەی پەلە نەدەکرد بۆ بنیاتنانی خوێندنگەکە. سەرەتا دەبێ کەشیشێکی باش هەبێ پاشان بیر لە دروستکردنی خوێندنگە بکرێتەوە)).
ئیدی کۆنین لە دوای ئەو یەکتربینینە ڕقێکی زۆری لە کەشیش دەبۆوە. ئەم کابرایە بەخۆی و سەروسیمای پێکەنیناویی و سۆزبزوێن و جبەی شۆڕی پڕ گنج و لۆچ و سەروسیمای هاوشێوەی ژنە لادێییبیانی و شێوازی ناڕێکی لە بەڕێوەبردنی نوێژەکانی لە کلیسا و شێوازی ژیان و ڕێزی تێکەڵ بە شەرمیەوە، سوکایەتی کردبوو بەو هەستە بچووکە لە باوەڕی ئاینیی کۆنین کە هێشتا لە



سینەیدا مابۆوە و سوکایەتی کردبوو بە تەواوی چیرۆکەکانی داپیرەی کە گەرمایی بەخشی ژیانی بوون. خوێنساردیی و بێباکیی ئەم پیاوە و لە چرکساتی ڕوبەڕوبوونەوەی هەستی خەمخۆریی و مشورخواردنی گەرمی کۆنین لە کاری پەیوەندیدار بە خودی ئەو، هەستی خۆپەرستیی کۆنینی ئازار دەدا.
عەسری ئەو ڕۆژە ماوەی دەمژمێرێك بەنێو ژورەکانی ماڵەکەیدا هاتوچۆی کرد و بیری کردەوە، پاشان بە شێوەیەکی بڕیاردەرانە چووە سەر مێزەکەی و کەوتە نوسینی نامەیەك بۆ ئەسقەف، دوای نوسینی ڕێز و سڵاو و نزای خێر و داواکردنی هەندێك پارە بۆ دروستکردنی خوێندنگەکە، بۆچوون و تێڕوانینی خۆی لەسەر باوکی ڕۆحانیی (چەشنی ڕۆڵەیەکی دڵسۆز) هێنایە سەر کاغەز: ((... ئەم کەشیشە گەنجە، زانیاری پێویستی نییە، پێدەچێ ئالودەی مەی بێت و بەگشتی وەڵامدەرەوەی ئەو چاوەڕوانی و داخوازیانە نییە کە بە درێژایی مێژوو میلەتی ڕوسیا لە شوانە ڕۆحیەکانیان هەیانبووە و هەیانە)). نامەکەی نوسی و ئاهێکی ئاسودەی هەڵکێشا و بەدەم هەستکردن بە ئەنجامدانی کارێکی چاك و سودبەخشەوە، چووە نێو نوێنەکەی.
سەرلەبەیانی ڕۆژی دوشەممە، کە هێشتا لەنێو جێگاکەی نەهاتبووە دەرێ، لە هاتنی باوکی ڕۆحانیی یاکۆف ئاگاداریان کردەوە. حەوسەلەی جێهێشتنی ئەو نوێنە گەرمەی نەبوو بۆیە ڕایسپاردن پێی بڵێن چۆتە دەرێ و لە ماڵ نییە.
دوو ڕۆژ دواتر، واتا ڕۆژی چووارشەممە چووە کۆبوونەوە و ڕۆژی شەممەش دوای گەڕانەوەی، خزمەتکارەکەی پێی ڕاگەیاند ئەو دوو ڕۆژەی کە لە ماڵ نەبووە باوکی ڕۆحانیی ڕۆژی جارێك هاتوە بۆ لای. کەوتە بیرکردنەوە: ((لەوانەیە حەزی چوویێتە نانە شیرنەکە)).
دەمژمێرێك بەر لە ڕۆژئاوابوون، باوکی ڕۆحانیی پەیدا بۆوە. ئەمجارەیان نەك تەنیا داوێنی جبەکەی، بەڵکو کڵاوەکەشی قوڕاوی بوو. چەشنی دیداری

یەکەمجار، ڕوخساری سورهەڵگەڕاو و ئارەقاویی و لەسەر لێواری کانەپەکە دانیشت. کۆنین لە دڵەوە بڕیاری دا بابەتی دروستکردنی خوێندنگەی لەگەڵدا نەکاتەوە و وەك دەڵێن: ئاسنی سارد نەکوتێ.

باوکە یاکۆف دەرگای قسەی کردەوە و گوتی: لیستێکی تەواو لە پێداویستیەکانی خوێندن بۆ هێناوی.

: سوپاست دەکەم.

بەڵام بەتەواوی ڕوون بوو کە باوکە یاکۆف لەبەر ئەم لیستە نەهاتبووە ماڵی کۆنین. سەرتاپای باڵای بەیانکەری شەرمێکی زۆر بوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا وەك ئەوەی پشکۆیان خستبێتە گیانییەوە، نیشانەگەلی ئەوەی کە بۆ کارێکی تر هاتووە، بە ڕوخساریەوە دەرکەوتن. دیاربوو پەلەی بوو لە بارەی بابەتێکی گرینگەوە بدوێ و هەوڵی دەدا بەسەر شەرم و لەڕووداماانی خۆی دا زاڵ بێت.

کۆنین لەم گۆڕانەی کەوتە بیرکردنەوە: (( بۆچی قسان ناکا؟ ئامادەی قسەیە و ورتەشی لە دەم دەرنایە! مەگەر نابینێ کاتی ئەوەم نییە ئەوەندە لەگەڵیدا دانیشم؟)).

کەشیش بەو نیازەی کە بڕێك لەو نیگەرانییە نابەجێیەی خۆی کەم کاتەوە و دڵەخورپەکەی ناخی تا ئەو شوێنەی کە دەکرێ بشارێتەوە، زەردەخەنەی دەسکردی دێنایە سەرلێوانی، ئەم زەردەخەنە بێ پسانەوە و ئازاراویانە بە هیچ جۆرێ لەگەڵ ئارەقە و ڕەنگی ڕوخسار و نیگای مۆلەقی چاوانی شینی نەدەهاتنەوە و کۆنینیان ناچار کرد ڕووی خۆی وەرگێڕێ و هەست بە نەفرەت بکات بەرامبەری. دواتر گووتی: ببوورە باوکە من کارم هەیە و دەبێ بڕۆم ...

باوکی ڕۆحانی چەشنی کەسێك کە لە خەوێکی شیرن ڕاپانپەڕاندبێ لە جێگای خۆی قووت بۆوە و لە حاڵێکدا کە بەردەوام زەردەی دەکرد و بە ڕوخسارێکی لێوانلێو لە شەرمەوە، کەوتە داخستنی قۆپچەکانی جبەکەی.



کۆنین سەرباری ئەو هەموو ڕق و نەفرەتەی بەرامبەری هەیبوو، لەناکاو دڵی بەحاڵی سوتا و بەزەیی پێدا هاتەوە، بەو مەبەستەی هەندێك لەو دڵڕەقیەی خۆی کەم کاتەوە، گووتی: تکا دەکەم باوکە، لێی گەڕێ بۆ جارێکی تر ... بەڵام بۆ ساتی خوداحافیزیمان تکایەکم لێت هەیە ... لەم ماوەیەدا ئیلهامم بۆ هات دو دانە وتارم نوسین ... هەردوکیان دەخەمە خزمەتت و بیانخوێنەوە ئەگەر بەدڵت بوون و شیاو بوون دەتوانی بۆ خۆت سودیان لێ وەرگری.

باوکی ڕۆحانیی دەستی خستە سەر وتارەکان کە لە سەر مێزەکە بوون و گوتی: زۆرباشە لەگەڵ خۆمدا دەیانبەم ...

دواتر خولەکێکی تر ڕاوەستا و چاوەڕوان مایەوە و لەناکاو زەردەخەنە دەسکردەکەی وەلانا و بڕیاردەرانە سەری بەرز کردەوە و لە حاڵێکدا کە هەوڵی دەدا قۆپچەکانی جبەکەی داخا و بە دەنگێکی ڕون و بەرز قسان بکا، گوتی: پاڤێل میخایلۆڤیچ!

- بەڵێ چ دەفەرموی؟

- بیستم گوتیان بەڕێزت ... ئەو ... سکرتێرەی خۆت ئیزن دەدەی و ئێستا ... بەدوای کەسێکی تردا دەگەڕێی ...

- بەڵێ وایە ... تۆ کەست پێ شك دێت؟

- بەڵێ ... من ... بۆخۆم ... ئەو چاکەیەم لەگەڵدا بکە و ئەو کارە بە من بسپێرە؟

کۆنین بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

- چیە باوکە ناکا واز لە کەشیشیی بێنی و بەرگی پیاوانی ئاینی فڕێدەی؟

باوکە یاکۆف کە ڕوون نەبوو بە چ هۆکارێکەوەیە ڕەنگی بە ڕوانەوە نەمابوو و سەرتاپای جستەی دەلەرزی، بە پەلە وەڵامی دایەوە:

- نا، نا! خودا بەو ڕۆژە نەکا! خوداوەند لە لاملی و نافەرمانی لەم چەشنە بمپارێزێ! ئەگەر لەمبارەیەوە بەو شێوەیە بیر دەکەیتەوە ئەوا گوێ بە قسەکانم مەدە! جگە لەوەی کە دەمەوێ دەرامەتێکی باشترم هەبێ، هیچ مەبەستێکی ترم نەبوو ... کەوابێ لەم گوتەیەم نیگەران مەبە و گوێی پێ مەدە و بە فەرامۆشیی بسپێرە!

- هم ... دەرامەت ... ئێ خۆ مانگانەی سکرتێرەکەم تەنیا بیست ڕۆبڵە!

باوکی ڕۆحانیی سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و لەژێر لێوەوە گوتی:

- ئای خودایە، من بە دە ڕۆبڵێش ئامادەم بیکەم! دە ڕۆبڵم بەسە! بەلاتەوە سەیر نەبێ، هەموان پێیان سەیرە و دەڵێن ئەو کەشیشە بەهەڵپەیە، ئەو کەشیشە چاو برسییە، ئەو کەشیشە چاوچنۆکە ئەو هەموو پارەیە چ لێ دەکا؟ ناهەقیان نییە خودی خۆشم هەست دەکەم مرۆڤێکی بەهەڵپە و تەماحکارم ... لەمبارەیەوە خۆم سەرکۆنەی خۆم دەکەم ... شەرم دەکەم سەیری چاوی خەڵکیی بکەم ... بەڵام پاڤێل میخایلۆڤیج ئێستا کە لە گەڵ تۆدام بە ویژدانەوە قسە دەکەم ... خودا بۆخۆی شاهیدە و ئاگاداری هەموو شتێکە ...

لێرەدا هەناسەی تازە کردەوە و درێژەیدایە:

- بەرلەوەی بێمە ئێرە کۆمەڵێك قسەم ئامادە کردبوو بیانکەم ... بەڵام هیچم وەبیر نەمان ... بڕوانە من لەپای ئەم کاری ڕۆحانییەتە ساڵی سەدوپەنجا ڕۆبڵ وەردەگرم و ... هەموان پێیان سەیرە چی لەو هەموو پارەیە دەکەم ... ئامادەم بە ویژدانەوە هەمو شتێکت بۆ ڕون بکەمەوە ... ساڵانە لەو سەدو پەنجا ڕۆبڵە چل ڕۆبڵی بۆ برایەکەم دەنێرم کە خوێندکاری زانستی ئاینییە، خوردوخۆراکی لە سەر خوێندنگەیە و قەڵەم و کاغەزیشی لەسەر من ...



کۆنین، دەستی ڕاوەشاند و لەو هەمو ڕاستگۆیی و بێ پەردەییەی میوانەکەی هەستی بە قورسایەکی ترسناك کرد و داماوانە لە ئاست بریسکەی نیگای چاوانی فرمێسکاویی باوکی ڕۆحانیدا گووتی:

- (( ئاه، باوەڕ دەکەم، باوەڕ دەکەم! پێویست بە باسکردن ناکات)).

- جگە لەمەش هێشتا تەواوی ئەو قەرزەم لەسەرە کە دووسەد ڕۆبڵە و لە پای دەسبەکاربوونی کەشیشیم دەبێ بیدەمە ئەنجومەنی خەلیفەگەری و ناچارم مانگانە دە ڕۆبڵ پەیدا بکەم و بیاندەمێ ... ئێستا خۆت ببە دادوەر و بزانە چیم بۆ دەمێنێتەوە! جگە لەوەش مانگانە دەبێ سێ ڕۆبڵ بدەمە باوکە ئاورام!

- کام باوکە ئاورام؟

- ئەو باوکە ئاورامەی کە بەر لە من کەشیشی سینکۆف بوو و لەبەر پیری و نەخۆشی لایانبرد ... بەڵام... ئێستاش هەر لە سینکۆف دەژی، ئەی بچێتە کوێ؟ کێ زگی تێر دەکا؟ ڕاستە پیر بووە بەڵام هەرچیەك بێت مرۆڤێکە و پێویستی بە پاروە نانێکە بیخوات و جل و بەرگێکە لەبەری بکات! من توانای ئەوەم نییە پیاوێکی ئاینیی ببینم دەرگا بە دەرگا بگەڕێ و سواڵ بکا! ئەگەر شتێکی بەسەربێ ئەوە ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی منە، داماوە کەوتۆتە ژێر باری قەرزەوە و ئەگەر قەرزەکانی بۆ نەدەمەوە ئەوا نافەرمانیم کردووە.

لێرەدا، جێگاکەی خۆی گۆڕی، نیگایەکی شێتانەی گرتە زەوی ژوورەکە، لە گۆشەیەکی ژورەکەوە بۆ گۆشەیەکی تر کەوتە هاتوچۆکردن، لە حاڵێکدا کە جار جار قۆڵەکانی بەرز ڕادەگرتن و جار جار شۆڕی دەکردنەوە، لەژێر لێوەوە گوتی:

- خودایە! ئای خودای گەورە ڕزگارمانکە، بەزەییت پێماندا بێتەوە! ئەگەر مرۆڤ باوەڕی هەر ئەوەندەیە و توانای ئەوەندە سنورداره بۆچی دەبێ ئەم هەموو

سەختی و دژواریانە قبووڵ بکا؟ دڵنیام نائومێدیەکانم کۆتاییبیان پێ نایەت.
یامریەمی پیرۆز رزگارمکە!
- ئارامت هەبێ باوکە!
بەڵام باوکە یاکۆف هەر بەردەوام بوو:
- لەژێر گوشاری برسێتی دا وەگیان هاتوم پاڤێلێ میخایلۆڤیج! گەورەیی بنوێنە و لێم ببوورە، لە توانامدا نەما ... دەزانم ئەگەر مل کەچ بکەم و دەست لەم و لەو پان بکەمەوە یارمەتیم دەدەن بەلاّم ... ناتوانم! شەرم دەکەم! لە رووم هەڵنایە! ئاخر چۆن دەکرێ یارمەتی لەو لادێییە داماو و قورپەسەرانە قبووڵ بکەم؟ بۆ خۆت لێرە خزمەت دەکەیت و لە نزیکەوە ئاگاداری شتەکانیت ... ئەوە چ دەستێکە کە لە گەدا پان دەکرێتەوە و داوای یارمەتی لە گەدا دەکا؟ عیزەتی نەفسیشم رێگەم نادا داوای کۆمەك و یارمەتی لە خاوەن موڵك و دەوڵەمەندەکان بکەم! غرورم هەیە! شەرم دەکەم.
لێرەدا دەستی بەرز کرد و بە جوڵەیەکی پڕ لە رقەوە بە هەردوو دەستی سەری خوراند و درێژەی دایە: - - شەرم دەکەم! ئای خودایە! شەرم دەکەم! حەزناکەم خەڵك بەو هەژاریەم بزانن. ئەو رۆژەی کە هاتیە ماڵی ئێمە تەنانەت یەك مستە چاشمان نەبوو پاڤێلێ میخایلۆڤیج! بەلاّم غرورم رێگەی نەدام راستیەکەیت پێ بڵێم! شەرم لەم لیباسانەی بەرم دەکەم ... لەم شڕەوپڕانە ... لەم جبەیەم ... لەم برسێتیەم ... بەلاّم ئایا شتێکی شیاوە کەشیش شەرم بکا؟
باوکی رۆحانیی لە ناوەڕاستی ژورەکەدا ڕاوەستا و بەجۆرێك وەك ئەوەی هەستی بە بینینی کۆنین هەر نەکردبێ، دەستی بە قسان کرد:
- دامنا خۆم توانیم بەسەر برسێتی و ریسواییدا زاڵ بم، ئەی چ لەو ژنە داماوەم بکەم! کچێکی پاك و بەناز پەروەردە کراوە و هەژاریی و برسێتیی نەبینیوە، ڕاهاتوە هەم چای هەبێ، هەم نانی سپی و هەم سەرچەف ... لە ماڵی باوکی



پیانۆشی هەبوو ... گەنجە، هێشتا بیست ساڵی تەواو نەکردووە ... لەوانەیە ئارەزوی لە نوێنی نوێ و کەلوپەلی خۆڕازاندنەوە و سەردان و ئەم شتانەش بێت ... بەلاّم بەدبەختە لەو ماڵەی مندا ژیانی چەشنی کارەکەرانە ... شەرم دەکەم بیبەمە کۆلاّنیش. ئای خودای گەورە! تاکە هۆکاری شادی و چێژ وەرگرتنی لە ماڵەکەی مندا تەنیا ئەوەیە لەماڵی ئەم و ئەوەوە سێوێك یان نانێکی شیرنی بۆ بەرمەوە ...
لێرەدا دیسانەوە سەری بە هەردوو دەستی خوراندەوە و لێی زیاد کرد: ئیدی روونە کە ئەمە هەستی بەزەیی پێداهاتنەوەیە، نەك ئیشق و خۆشەویستی ...
ناتوانم بەبێ هەستکردن بە هاودەردیی لێی بڕوانم! ئەم پێشهاتانە چن ڕوودەدەن؟ پێشهاتەلێکن ئەگەر لە رۆژنامەکاندا لە بارەیانەوە بنوسن کەس باوەڕیان پێ ناکا ... دەبێ هەموو ئەمانە کەی کۆتاییبیان پێ بێت؟ کۆنین کە لە ئاوازی دەنگی وی ترسی رێنیشتبوو، وەك هاوارێك هاواری کرد: بەسە باوکە! نابێ هێندە رەشبینانە سەیری ژیان بکرێ!
باوکە یاکۆف چەشنی سەرخۆشان لە ژێر لێوەوە گووتی:
- گەورەیی بنوێنە و ببەخشە، گرینگی بەم قسانەم مەدە ... گوێیان پێ مەدە ... من خۆم ... خۆم بە کەمتەرخەم دەزانم ، دەزانم کەمتەرخەمم ... بەلێ کەمتەرخەمم!
پاشان سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و بە سرتە گووتی:
- رۆژێکیان بەیانی زوو لە سینکۆفەوە بەرەو لۆچکۆڤۆ دەچووم بینیم ژنێك لە کەنار ئاوەکەیە و سەرگەرمی ئەنجامدانی کارێکە ... چوومە پێشتر خەریکبوو لەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرە شاخ دەربێنم ... بەڕاستی دیمەنێکی سەیر بوو بەلامەوە! ژنەکەی دکتۆر ئیڤان سێرگییچ - کە دەڵێن لە زانکۆش خوێندویەتی - لە کەنارئاوەکە دانیشتبوو و خەریکی جلشۆرین بوو! لەبەرئەوەی کەس

**نەیبینیٚ بەو شەبەقییە لە خەو هەستابوو و نزیکەی فرسەخێك ڕێگای بڕیبوو و لە دیٚ دوور کەوتبۆوە ... ئەمە پێی دەڵێن غروری لەشکان نەهاتوو! هەرکە هەستی کرد من بینیومە لەشەرمان وەك چەوەندەر سور هەڵگەڕا ... من پەلەم کرد ، ترسام، بەرەو لای ڕامکرد ، حەزم دەکرد یارمەتی بدەم، بەلاٚم ئەو خێرا بەپەلە جل و بەرگەکانی شاردنەوە و ترسی لەوەبوو کراسە کۆن و داڕزیوەکانی ببینم ...**

**کۆنین دانیشت و لە حاڵێکدا بە چاوانی پڕ لە ترس و سەرسوڕمانەوە لە ڕوخساری ڕەنگ لیٚ بڕاوی باوکە یاکۆفی دەڕوانی، گوتی: ئەم شتانە، تەنانەت بە شێوەیەکن کە جێگای باوەڕ نین ...**

**- بەڵی، جێگەی باوەڕ نین، پاڤێل میخایلۆیج هەرگیز نەبینراوە ژنی دکتۆران بچنە سەر ڕوباران و جلوبەرگی خۆیان بشۆن، ئەم شتە مەحاڵە لە هیچ ولاٚتێکی تر ڕوویدابیٚ و ڕوودات! من وەك ئەرکی بەرپرسیارێتی و لەژێر ناوی شوانی خەڵکیی و باوکی ڕۆحانیی دا نابیٚ لێگەڕێم شتی لەو چەشنە دووبارە بێتەوە، بەلاٚم فەرموو من بە تەنیا چیم پیٚ دەکریٚ؟ دەفەرمو دەی؟ ئەوە جاریٚ من وا خواخوای ئەوەمە مێردەکەی بە خۆڕایی چارەسەرم بکات! ڕاست دەکەی کە گوتت ئەم شتانە جێگای باوەڕ نین! منیش باوەڕ بە چاوەکانی خۆم ناکەم! لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ، دەزانی، هەندێك جار کە لە پشت پەردەی میحرابەکەوە سەیری مرۆڤەکانی نێو حەوشی کلیسا ، لەنێویشیاندا سەیری ئاورامی برسی و ژنەکەی خۆم دەکەم، ئازار دەچێژم! بەلاٚم هەرکە ژنەکەی دکتۆرم بیر دەکەوێتەوە نەك هەر ئەوان بەڵکو خۆشم فەرامۆش دەکەم و چەشنی مرۆڤە گەمژەکان هێندە بەقوڵی ڕۆدەچم و لە حاڵەتێکی چەشنی بێهۆشی دا دەمێنمەوە تا شماس وەئاگام دێنێتەوە بانگم دەکا ... ترسناکە!**



**خولەکێك بەنێو ژورەکەدا هاتوچۆی کرد و دواتر دەستی ڕاوەشاند و لێی زیاد کرد :**

**- یا حەزرەتی عیسا ، پەنات وەبەر دێنم! ئیدی خەریکە لە ئەنجامدانی ئەرکە ئاینییەکانی کلیساش وەڕەز بم ... بۆ نموونە تۆ لەبارەی دروستکردنی خوێندنگەوە قسەم لەگەڵدا دەکەی بەلاٚم من هیچ سەر لەم قسانەی تۆ دەرناکەم، وەك ئەوەی بووبێتمە پەیکەر ... جگە لە خوردوخۆراك، بیر لە هیچ شتێکی تر ناکەمەوە ... تەنانەت لە نێو کلیسا و لە بەرامبەر میحرابیشدا ...**

**لەناکاو هاتەوە سەر خۆی و درێژەی دایە:**

**- جاریٚ ... ئەم قسانە هیچ سودێکیان نییە ... تۆ بریار بوو بچیتە شوێنێك ... لێم ببوورە ... دوای لێبووردنت لیٚ دەکەم لەم قسانە ...**

**کۆنین بیٚ گوتنی تاقە وشەیەك، دەستی باوکی ڕۆحانیی گوشی، تا بەر دەرگا بەڕێی کرد و هەرکە گەڕایەوە ژوری کارەکەی، بەرەو لای پەنجەرەکە چووو و لە بەردەمیدا ڕاوەستا. لەوێڕا باوکی ڕۆحانیی بینی کە لە ماڵیٚ وەدەرکەوت، سەری داخست وەك ئەوەی لە وتنی ئەو ڕاستیانە هەستی بە شەرم کردبیٚ، لەسەرخۆ کەوتەڕیٚ.**

**کۆنین بیری کردەوە: (( ئەسپەکەی دیار نییە!)).**

**کە بیری کەوتەوە لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەی کە لە ماڵ نەبووە باوکە یاکۆف چەند جارێك بە پێیان هاتبووە سەردانی، ڕاچڵەکی: باوکی ڕۆحانی ناچاربووە ماوەی حەوت هەشت ڤرست ڕێگەی نێوان سینکۆف و ماڵەکەی وی، بە پێیان و بەنێو قوڕ و چڵکاودا بکوتێتەوە.**

**دواتر گالیسکەوانەکەی خۆی ( ئەندرێی ) و کوڕەکەی ( بارامن ) ی بینی کە بە هەڵەداوان و هەڵبەز و دابەز بەنێو چاڵ و قۆڵتەکاندا بەرەو لای باوکی ڕۆحانی خۆیان دەکوتا و قوڕ و چڵکاوی ژێر قاچیان بەسەر و ڕووی دا هەڵپژاند.**

بەرەو لای دەچوون تا نزای خێریان بۆ بکات و دەستێك بە سەری کورپژگەکەدا بێنێ.

کۆنین دەستێکی بە سەر و ڕووی خۆیدا هێنا و وای هەستکرد دەستی تەڕ بووبێ، لە بەردەم پەنجەرەکە لاچوو و نیگای لێڵی چاوانی بە ژوورەکەدا - کە هێشتا دەنگی شەرمن و گیراوی باوکە یاکۆف تێیدا دەنگی دەدایەوە - گێڕا ... نیگای لە زەویەکە چەقی ...

خۆشبەختانە باوکی ڕۆحانیی بیری چووبوو ئەو وتارانەی کە ئەو بۆی نوسیبوون لەگەڵ خۆی دا بیانبات ... کۆنین بەرەو لای مێزەکە چووو، وتارەکانی هەڵگرتن و وجڕ وجڕی کردن و فڕێیدانە ژێر مێزەکە، لە حاڵێکدا کە لەسەر کاناپەیەکی پێچکە کورت دادەنیشت، بە ناڵەناڵەوە گوتی:

- ئاگاداری ئەم شتانە نەبووم، سەیرکە چەندە کەسێکی بێئاگا بوومە! دەبێ هاوکاریان بکەم! دەبێ هەرچی زووە هاوکارییان بکەم!

بە شێوەیەکی ئازاراوی پێچی دەدا، ئەملا و ئەولای سەری دەگوشی، هەوڵی دەدا بیروهۆشی خۆی کۆکاتەوە و بەخۆی دەگوت: (( بیستی ئەم مانگە دووسەد ڕۆبڵ موچە وەردەگرم ... بیانویەکی باش دەدۆزمەوە و هەندێك پارە دەدەمە ئەو و ژنەکەی دکتۆر ... بۆ نموونە بە ناوی فاتیحا خوێندنەوە بانگێشتی ماڵەوەی دەکەم و دەچمە لای دکتۆریش و خۆم دەکەمە نەخۆش و بەو هۆیەوە هەندێك پارەی دەدەمێ، ئیدی بەم شێوەیە هەست ناکەن کە هاوکاریم کردون و کەسایەتییان ڕوشاوە ... هەروەها هاوکاریی باوکە ئاورامیش دەکەم.

بە یارمەتی پەنجەکانی کەوتە ژماردنی ئەو پارەیەی کە بڕیار بوو وەریبگرێ و دەترسا لەوەی بە خۆی بسەلمێنێ کە ئەو بڕە پارە ناچیزە بە زەحمەت بەشی بەڕێوەچوونی خۆی و مانگانەی پێشکار و خزمەتکارەکەی و هەقی ئەو پیاوە لادێییە دەکا کە بەین نابەین دێ و گۆشتی بۆ دێنێ ... بێ ئیختیار کەوتەوە



یادی ئەو ڕۆژانەی - کە ڕابردویەکی هێندە دوور نەبوو - گەمژانە سەروەت و سامانی باوکی بە هەدەر دەدا و لە تەمەنی بیست ساڵی دا بەو پەڕی دڵفراوانییەوە باوەشێنی گرانبەهای بۆ ژنە سۆزانییان دەکڕی و ڕۆژانە دە ڕۆبڵی دەدایە کۆزمای گالیسکەڕانی ... ئاخ ئێستا ئەو سێ ڕۆبڵی و دە ڕۆبڵیانە چەندە بەکاری دەهاتن! کەوتە بیرکردنەوە: (( باوکە ئاورام مانگانە تەنیا بە سێ ڕۆبڵ درێژە بە ژیان دەدات، ژنەکەی باوکە یاکۆف بە ڕۆبڵێك دەتوانی کراسێکی نوێ بۆ خۆی دروست بکا، ژنەکەی دکتۆریش دەتوانێ بە ڕۆبڵێك لە کۆڵ جل شتن بێتەوە. دەبێ حەتمەن یارمەتیان بدەم حەتمەن!)).

لێرەدا لەناکاو کەوتەوە یادی ئەو ڕاپۆرتەی کە بۆ ئەسقەفی نوسیبوو و وەك ئەوەی سەرمایەکی لەناکاو لێی دابێ، خۆی خڕ کردەوە. ئەم بیرهاتنەوەیە ڕۆحی پڕ کرد لە هەستکردن بە شەرمێکی ئازاردەر ...

ئەمەبوو دەسپێك و کۆتایی هەوڵی ڕاستگۆیانەی مرۆڤێکی نیازپاك و لە هەمان کاتیشدا زیاد لە ئەندازە تێروپڕ و زیاد لە ئەندازە شیاو، لە دەسبردن بۆ کاری چاك و سودبەخش.

# سکۆلاڤەکانی* لادێ

نەخۆشخانەیەکی حکومییە، کات سەرلەبەیانییە.

کۆزما یگۆرۆڤ و گلێب گلێبیج، بەهۆی ئامادە نەبوونی ئیڤان یاکۆلۆڤیجی پزیشکی نەخۆشخانەکەوە کە لەگەڵ سەرۆکی پۆلیسدا پێکەوە چوونەتە ڕاوێ، نەخۆشەکان دەبینن. ژمارەیان نزیکەی سی نەخۆش دەبێ. کۆزما یگۆرۆڤ لە ژووری بینینی نەخۆشان دانیشتوە و کاسنیی کولاو دەخواتەوە و چاوەڕوانی تەواوبوونی کاروباری ناونوسینی نەخۆشەکانە.

گلێب گلێبیجیش کە لە ژیانیدا سابوون و شانەی بەخۆیەوە نەدیوە، ورگ و سینگی بەسەر مێزەکەدا شۆڕکردۆتەوە بە حاڵەتێکی تێکەڵ بە توڕەییەوە پرسیاری ناو و ناونیشان و تایبەتمەندییەکان لە نەخۆشەکان دەکا و لە دەفتەرەکەی بەردەمیدا دەیاننوسێ. ئەم کاروباری نوسینە تەنیا بە مەبەستی ئامار ئەنجام دەدرێ. ئەو زانیاریانەی لە دەفتەرەکەدا دەنوسرێن بریتین لە ناو، ناوی باوك، شۆرەت، پیشە، شوێنی ژیان، ئاستی خوێندن، تەمەن، جۆری نەخۆشی و وەهەروەها دوای بینینی نەخۆشەکەش جۆری ئەو دەرمانەی کە بۆی دیاری کراوە لە دەفتەرەکەدا یاداشت دەکرێن. گلێب گلێبیج، لە دەفتەرێکی



گەورەدا و لەسەر کاغەزە بچووکەکان وێنەی قرژاڵ و بۆق دەکێشێ و بە توڕەییەوە دەنەڕێنێ:

- سندان لەم قەڵەمانەدا! ئەی ئەمە چ مەرەکەبێکە! دەڵێی قەترانە نەك مەرەکەب، ئاخ لەدەست ئەنجومەنی ناوچە! فەرمان دەدەن ناوی نەخۆشان بنوسم بەڵام کوا پارەی مەرەکەب!

پاشان هاوار دەکا:

- وەرە پێشێ!

لادێییەك، کە سەر و ڕووی خۆی هەڵپێچاوە و میخائیلۆیەکی بەم، بەرەو لای مێزەکە دەچن.

- ناوت؟

- ئیڤان میکۆلۆڤ.

- چی؟ گوتت کێ؟ بە ڕوسیی قسان بکە!

- ئیڤان میکۆلۆڤ.

- ئیڤان میکۆلۆڤ! لەگەڵ تۆم نەبوو! تۆ بڕۆ ئەولاوە! لەگەڵ ئەمەمە. ناوت؟

- میخائیلۆ بە زەردەخەنەوە وەڵام دەداتەوە:

- مەگەر خۆت ناوم نازانی؟

- ئەمە پێویستی بە پێکەنین نییە! سندان لە هەمووتاندا! دروست ئەو کاتەی مرۆڤ کاتی نییە سەری خۆی بخورێنی ئنجا ئەمانە حەزی گاڵتە و فشقیاتیان دەبزوێ! دەپرسم ناوت چیە؟

- سەیرکە، مەگەر ناوم نازانی؟ ناکا بەم بەیانییە سەرخۆش بیت؟

- دامنا سەرخۆشم، بەڵام دەبێ بپرسم ... ئەمە بەشێکە لە ڕێوشوێنە یاساییەکان ... ئیدی خۆ من وەك بەڕێزتان هەمیشەمەست نیم! ئێمە لە مەیخۆران نین ... ناوی سیانیت؟

- کاتێ خۆت ناوم دەزانیت چ پێویست دەکا من پێت بڵێم؟ پێنج ساڵە دەمناسیت ... خێرە ساڵی شەشەم ناوی منت بیرچۆوە؟
- بیرم نەچۆتەوە بەڵام پێمگوتی ئەمە بەشێکە لە ڕێوشوێنە یاساییەکان! تێگەیشتی؟ چیە دەڵێی لە زمانی ڕوسیی تێناگەی؟
- ئێستا کە شتەکە بەشێکە لە ڕێوشوێنە یاساییەکان! بنوسە! میخائیلۆ فیۆدۆتیج ئایزمۆچینکۆ ...
- ئایزمۆچینکۆ نا ئایزمۆچینکۆڤ!
- باوابێ، بنوسە ئایزمۆچینکۆڤ ... هەرچۆنێك پێت خۆشە وای بنوسە ، تەنیا چارەسەرم بکە ... تەنانەت ئەگەر حەزدەکەی بنوسە (( ئیڤان قەشمەر )) ... هیچ جیاوازی نییە ... هەموویان یەکن ...
- پیشەت؟
- بەم.
- تەمەنت چەندە؟
- من چووزانم! ئەو ڕۆژەی غوسڵ تەعمیدیان کردم بیریان چووبوو بانگێشتم بکەن بۆ مەراسیمەکە.
- چل ساڵ دەبی؟
- لەوانەیە ببم و لەوانەشە نەبم ... کورە هەرچەندی پێت خۆشە بینووسە.
گڵێب گڵبێبیج یەك دو جاران بەچاو سەرتاپای باڵای کابرا تاووتوێ دەکا و هەندێك چاوەڕوان دەمێنێتەوە و پاشان خەتێك بەسەر 37 دا دێنێ و دەنوسێ 41.
- خوێندەواریت هەیە؟
- لەکوێ دیوتە کابرا سرودخوێنی کلیسا بێ و خوێندەواری نەبێ؟ هەی کەللەپوت!



- بیرت نەچێ نابێ لەلای خەڵکیەوە بەم شێوەیە لەگەڵمدا بدوێی. مەیکە هاتوهاوار. نەفەری دواتر وەرە پێشێ! کێی! ناوت چیە؟
- میکیفۆرِ پۆگۆلۆڤ ، خەڵکی ئاوایی خاپلوو.
- خەڵکی خاپلوو چارەسەر ناکەین! نەفەری دواتر! تۆ بڕۆ ئەولاوە! لێرە جگەرە مەکێشە!
- کوا خۆ من جگەرەکێش نیم گڵێب گڵبێبیج!
- ئەی ئەوە چیە بەدەستەوە؟
- پەنجەمە بەستومە، گڵێب گڵبێبیج!
- وامزانی جگەرەیە. گووتم: خەڵکی ئاوایی خاپلوو لێرە چارەسەر ناکەین! نەفەری دواتر! ...
گڵێب گڵبێبیج، بەم شێوەیە کۆتایی بە ناونوسینی نەخۆشەکان دێنێ. کۆزما یگۆریچیش لە کاسنیی کولاّو خواردنەوە دەبێتەوە و سەرەنجام نۆرە دەگاتە سەر بینینی نەخۆشەکان.
گڵێب گڵبێبیج کە سەرپەرشتی دەرمانخانەکەی بە ئەستۆوەیە دەچێتە سەر کاری خۆی و کۆزما یگۆریچیش کە لە ژێر ناوی بەرێوەبەری بەشی نەخۆشیە هەناوییەکان دا کار دەکا، بەروانکەیەکی موشەمما بە سینگی خۆیەوە دەکا و بەپێی پێڕستی دەفتەرەکە بانگی نەخۆشەکان دەکا.
- ماریا زاپلاسکینا!
- ئەوەتام، هاتم.
پیرەژنێکی وردیلە و چرچوولۆچ وەك ئەوەی چارەنووسی بەدکار هەموو هەوڵێکی خۆی بۆ تواندنەوە و لەناوبردنی ئەم، خستبێتە گەڕ، دێتە ژووری بینینی نەخۆشانەوە، خاچێك لەسەر سینگی خۆی دەکێشێ و بەنیشانەی ڕێز سەرێك بۆ سکۆلاپ دادەنوێنێ.

**- هم ... دەرگاکە داخە! ... کوێت دێشێ؟**

**- سەرم دێشێ.**

**- ئەها ئاوا ... سەرت هەمووی دێشێ یان نیوەی؟**

**- هەموی ... بەڵێ هەموو سەرم دێشێ ...**

**- چیە! بۆچی ئەو هەموو شڕوشیتاڵەت لە سەرت پێچاوە؟ ئەو پڕوپاتاڵانە لەسەرت بکەوە! مرۆڤ دەبێ سەری سارد و قاچەکانی گەرم و جەستەشی مامناوەندی ڕاگرێ، تێگەیشتی؟ دڵیشت دێشێ؟**

**- ئەرەوەڵا ئازاری هەیە ...**

**- ئەها ئاوا!... بە پەنجەت پێڵوی خوارەوەت ڕاکێشە خوارێ ... بەسە! خوێنت کەمە ... قەترەت بۆ دەنوسم. ڕۆژی سێ جار، بەیانیان و نیوەڕوان و شەوان دە قەترەی لێ بخۆ.**

**دواتر دادەنیشێ و دەکەوێتە نوسینی ڕەچێتەکەی:**

((rp.

(( liquor* ))

3gr.

**لەو شوشەیەی کە لەسەر پەنجەرەکەیە نەك شوشەی سەر تاقچەکە چوونکە ئیڤان یاکۆلۆڤیج گوتویەتی نابێ سەری بکرێتەوە. ڕۆژی سێ جار و هەر جارەی دە قەترە بدرێتە ماریا زاپلاسکینا))**

**پیرەژن دەپرسێ دە قەترەکە بەر لە نانخواردن بخوا یان دوای نانخواردن و دواتر جارێکی تر سەر دادەنوێنی و دەچێتە دەرێ. کۆزما یگۆرۆڤ ڕەچێتەکە لەو**



**پەنجەرەی کە لە دیوارەکە کردویانەتەوە، ئاودیوی دەرمانخانەکە دەکا و بانگی نەخۆشێکی تر دەکا:**

**- تیمۆتی ستۆکۆڤی!**

**- بەڵێ!**

**ستۆکۆڤی دێتە ژوورێ. پیاوێکی بالابەرزی ڕەقەڵە و سەرزلە - لەدووررا بە دارێك دەچێ دەسکی داردەستیان پێوە بەستبێ.**

**- کوێت دێشێ؟**

**- دڵم دێشێ کۆزما یگۆریج.**

**- کوێی دڵت؟**

**ستۆکۆڤی چالایی سینگی نیشان دەدا.**

**- ئەها ... لەکەیەوە ئازارت هەیە؟**

**- لە جێژن بەدواوە ... ئێستاش تا گەیشتومەتە ئێرە ناچاربووم دە جار دانیشم و پشوو بدەم ... لەرزیشم لێیە ... کۆزما یگۆریج ... جاری واشە تام دێتێ، کۆزما یگۆریج ...**

**- هیچ شوێنی ترت دێشێ؟**

**- چیت لێ بشارمەوە، کۆزما یگۆریج هەموو لەشم دێشێ بەلام تۆ لەوانە گەڕێ تەنیا دڵم چارەسەرکە ، لە دەردەکانی ترم گەڕێ ... بۆ چارەسەری دەردەکانی ترم دەچمە لای پیرەژنان ... پێمباشە جۆرێك کحولم بدەیتێ کە ئاشوب لە ناو دڵمدا بەرپا نەکا، وەلا ئەوەندە ئاشوب بەرپا دەکا تا چنگ لێرەم گیر دەکا ... توشی حاڵێك دەبم وەك ئەوەی پێستی پشتم بگرون ... سەرم ئەوەندە قورس دەبێ وەك ئەوەی پڕیان کردبێ لە بەرد ... کۆخەشم لێیە.**

**- ئیشتیهای خواردنت باشە؟**

**- نە بەخوا!...**

کۆزما یگۆرۆڤ لێی نزیك دەبێتەوە، جەستەی کابرای نەخۆش لەکەمەرەوە دەنوشتێنێتەوە، بە مست  گوشار دەخاتە سەر سینگی کابرای نەخۆش و دەپرسێ:

- ئاوا ئازاری هەیە؟

- ئاخ ... ئاخ! بەڵێ، ئازارم هەیە.

- ئەی ئاوا؟

- وای ... مردم زۆر دێشێ!!

کۆزما یگۆرۆڤ چەند پرسیاری تریشی لێ دەکات، دەکەوێتە بیرکردنەوە و وەك کۆمەك و هاوکاریەك بۆ دەسنیشان کردنی نەخۆشیەکە، بانگی گڵێب گڵبێییج دەکات. ڕاوێژی پزیشکی دەسپێدەکات. گڵێب گڵبێییج ڕوو دەکاتە نەخۆشەکە و دەڵێ:

- زمانت دەربێنە!

کابرا دەمی دەکاتەوە و زمانی دێنێتە دەرێ.

- زیاتر!

- لەمە زیاتر دەرنایە گڵێب گڵبێییج!

- دەرنایە چیە؟ هیچ شتێك نییە نەکرێ!

گڵێب گڵبێییج، سەرتاپای جەستەی کابرا چەندین جار تاووتوێ دەکا و دەپشکنێ، قیافەیەکی خەمبارانە بەخۆوە دەگرێ، ساتێك لە فکران ڕادەچێ، پاشان شانەکانی هەڵدەتەکێنێ و بێ گوتنی تاقە وشەیەك، ژوورەکە جێ دێڵێ. بەڵام دوای خولەکێك، لە دەرمانخانەکەوە هاوار دەکا:

- لەوانەیە هەڵامەتی بێ.

کۆزما یگۆرۆڤیش لە شوێنی خۆیەوە دەنەڕێنێ:



( ammonii coustici*) و هەروەها (olei ricini*)-ی بدەرێ! با بەیانیان و عەسران زگی خۆی پێ چەوور کات. نەفەری دواتر!

ستۆکۆفی دەچێتە دەرێ و بەرەو لای پەنجەرەیەکی تری دەرمانخانەکە کە بەسەر باخچەیەکدا کراوەتەوە، دەکەوێتەڕێ. گڵێب گڵبێییج بە ئەندازەی یەك لە سەر سێی پەراخێك، ڕۆن گەرچەکی دەداتێ. ستۆکۆفی ڕۆن گەرچەکەکە وەردەگرێ و یەکبین بەسەریەوە دەنێ و لێوەکانی دەلێسێتەوە، پێڵوەکانی دەخاتە سەر یەك و پەنجە لە پەنجە دەسوێ واتا کە تامی هەیە. گڵێب گڵبێییج شوشەیەکی بچووکی کە ڕۆحی نیشادرە دەداتە دەست و دەڵێ:

- ئەمەش کحول! هەموو ڕۆژێ بەیانیان و عەسران بە پارچە قوماشێکی ماهوت، لە زگتی هەڵسوو ... هەرکاتێ تەواو بوو شوشەکەمان بۆ بێنەوە! پاڵ بەو مێزەوە مەدە! بڕۆ ئەولاوە!

لەم کاتەدا پێلاگێیا، خزمەتکارەکەی باوکە گریگۆری، لە کاتێکدا کە دەمی بە چمکێکی لەچکەکەی گرتوە و پێکەنین گرتوێتی، لە پەنجەرەی دەرمانخانەکە نزیك دەبێتەوە.

گڵێب گڵبێییج دەپرسێ:

- فەرمایشتێکت هەبوو؟

- لیزاڤتا گریگۆرێڤنا سڵاوی لێ دەکردی و فەرمویان چەند دانە حەبی نەعنایی بۆ بنێری.

- بە خۆشحاڵیەوە ... تا گیانم لەبەردایە ئامادەی خزمەتکردنی خاتونە نازدارەکانم!

پاشان بتڵێکی شوشە لەسەر تاقچەکە هەڵدەگرێ و نیوەی بەتاڵ دەکاتە ناو دەسماڵەکەی پێلاگێیا و دەڵێ:

- پێی بڵێ ئەودەمەی کە خەریکبووم حەبەکانم دەدایە زۆر خۆشحاڵ بووم و لەناخەوە پێدەکەنیم. ئەرێ ئەو نامەیەی بۆم ناردبوو گەیشتبووە دەستی؟

- بەڵێ، بەڵام دڕاندی. لەگەڵ عیشق و خۆشەویستی و ئەمانە نێوانی زۆر باش نییە.

- ئامان لەدەست ئەم تەمبەڵ خاتونانە! ئەگەر چوویتەوە پێی بڵێ پێی گوتوی تەمبەڵ خاتون!

کۆزما یگۆرۆڤ بانگی نەخۆشێکی تر دەکا:

- میخائیلۆ ئایزمۆچینکۆڤ!

میخائیلۆی بەم، بەرەو ژوری بینینی نەخۆشان دەڕوات. کۆزما یگۆرۆڤ دەڵێ:

- ڕێزمان هەیە میخائیل فیدۆتیچ! کوێت دێشێ؟

- قورگم، کۆزما یگۆرۆڤ. هاتمە خزمەتتان تا ... بە جەنابتان بڵێم، ئەگەر بەڕێزتان بفەرمون سەبارەت بە تەندروستی بەندە ... زیان و زەرەرم زیاترە لە ئازار ... لە تاو قورگئێشە، شەوانە خەوم لێ ناکەوێ، سەرپەرشتیاری گروپەکەمان لەبری ئامادەنەبوون لە هەر کارێکی گروپەکە، چل کۆبیکی موچەکەمان لێ دەبڕێ ... دوێنێ شەوێ لە مەجلیسی خەتمی یەکێك لە بەڕێزانی شار، هەموو سرودبێژانی کلیسا، هەریەکەو سێ ڕۆبڵیان دەسکەوت بەڵام من بەهۆی ئەو قورگئێشەیەوە نەمتوانی سرودبێژیی بکەم و یەك فلسم دەسنەکەوت. سەبارەت بە قورگیشم بە مۆڵەتی بەڕێزت دەبێ بڵێم خڕەخڕێکی زۆری لێوەدێ و بەجۆرێك ڕادەکێشرێ و دەلەرزێ - وەك ئەوەی پشیلەیەك چووبێتە گەرومەوە و چنگوڕکی لێ گیر کات ... هم ...

- پێتوانییە هی خواردنەوە بێ؟

- ئەگەر ڕاستییت دەوێ نازانم، نازانم بەڵام دەبێ لە خزمەتتاندا بڵێم - ئەڵبەتە لە سەر ئیزنت - کە خواردنەوە ژێی (( تینۆر )) وێران دەکا، نەك ژێی باس.



خواردنەوە شکۆ و توانا بە باسەکان دەبەخشێ جەنابی کۆزما یگۆرۆڤ ... بەڵام سەرما کاریگەری زیاتر لەسەر باسەکان دادەنێ.

گلێب گلێبێییچ، لە پەنجەرەی دەرمانخانەکەوە سەرێك دەکێشێتە دەرێ و دەپرسێ:

- ئەرێ نەتگوت چی بدەمە ئەو پیرەژنە! ئەو شوشەیەی سەر پەنجەرەکە بەتاڵ بووە، دەمەوێ ئەو شوشەیەی سەر تاقچەکە داگرمە خوارێ.

- نا، نا! نەکەی! نەیکەیتەوە! ئیڤان یاکۆلۆیچ گوتویەتی نەیکەنەوە! با تورە نەبێ.

- ئەی چی بدەمێ؟

- بۆ خۆت شتێکی بدەرێ!

لە فەرهەنگی گلێب گلێبێییچ دا (( شتێك )) جگە لە سۆدا هیچ واتایەکی تری نییە.

کۆزما یگۆرۆڤ ڕوو دەکاتە میخائیلۆ و دەڵێ:

- نابێ دەم بۆ خواردنەوە بەریت.

- ئەمڕۆ سێ ڕۆژە نەمخواردۆتەوە ... خۆم ئاگام لە دەردی خۆم هەیە ... سەرمابردوویی ... کۆزما یگۆریچ، دەزانم کە ڤۆدکا کەمێك خڕەخڕ و دەنگنوساوی دروست دەکا بەڵام بەڕێزیشتان دەزانن کە شکۆ بە دەنگی باس دەبەخشێ ... ئێمە، سرودبێژان، کاروبارمان بێ خواردنەوە ناڕوا ... سرودبێژێك کە نەخواتەوە فلسێکی سوتاو ناهێنێ! سرودبێژێك کە نەخواتەوە دوور لە ڕووی جەنابت، گاڵتەجارە، نەك سرودبێژ! ئەگەر هاتبا و ئەمە پیشەم نەبووایا مەحاڵ بوو دەم بۆ ئەو ژەهرەمارە بەرم ... دەزانی، ڤۆدکا خوێنی شەیتانە.

- زۆرباشە، تۆزت دەدەمێ ... دوای ئەوەی لە ئاودا تواندتەوە، بەیانیان و دوانیوەڕوان غەرغەرەی پێ بکە ...

- دەکرێ قوتی بدەم؟

- ئەڵبەتە.

- حەیفە مرۆڤ قوتی نەدا. من شتێك ئەوەندە لەناودەمدا بێنم و بەرم و دواییش تفی کەمەوە، زۆر دڵگران دەبم! ڕاستیەکەی پرسیارێکی ترم هەیە ... گەدەشم زۆر باش نییە و بەو هۆیەوە، بە ئیجازەی بەڕێزتان، هەموو مانگێ کەڵشاخ دەگرم و گیای کێویی کوڵاو دەخۆمەوە، دەتوانم ژن بێنم یان نا؟

- نا، باش نییە!

- سوپاسی بەڕێزتان دەکەم ماندوم کردن ... کوا دکتۆری وەك تۆ! بەخوا هیچ دکتۆرێك بە تۆزی پێڵاوەکانیشت ناگا! خەڵك هەموو نزای بەخێرت بۆ دەکەن!

کۆزما یگۆرۆڤ لە شەرمان و خاکی بوونی، چاو دەبڕێتە زەویەکە و بوویرانە درێژە بە نوسینی ڕەچێتەکە دەدا: NATRI BIC ARBONICI واتا سۆدە .

(سکۆلاپ *) خوداوەندی ساغی و تەندروستی لە ئەفسانەکانی ڕۆم

(( liquor* )) گیراوەی مادەی ئاسن.

((olei ricini*)) ڕۆن گەرچەك.

(( ammonii cousticí* )) ڕۆحی نیشادر

## ثـــا رضة

(كۆزرۆگۆڤ)، كارمەندی پلە پێنج، كاتێ خانەنشین كرا پارچە زەویەكی بچووكی كڕی و تیایدا نیشتەجێ بوو و تا ڕادەیەك لاسایی پرۆفیسۆر (كایگۆردۆڤ) ی دەكردەوە و ئەو شتانەی كە لە سروشت دا دەیبینین یاداشتی دەكردن. یاداشتەكانیشی هاوكات لەگەڵ سەرجەم موڵك و سامانەكەیدا بە هۆی وەسیەتنامەیەكەوە كە بەر لە مردنی نوسیبووی بوونە موڵكی ( مارڤا یۆلامپییێڤنا ) ی چاودێری خەرجییەكانی.

هەروەك هەموان ئاگادارن ئەو پیرەژنە بەڕێزە خانوی ئاغایانەی لەگەڵ خاك دا یەكسان كرد و لە جێگایدا مەیخانەیەكی خۆشی قووت كردەوە كە جۆرەها خواردنەوەی كحولیی تێدا دەفرۆشرا. مەیخانەكە بۆ گەشتیارە دەوڵەمەند و خاوەن موڵكەكان ژورێكی تایبەتی (خاوێنی) تێدابوو كە یاداشتەكانی كۆزرۆگۆڤی خوالێخۆشبوویان تێدا لەسەر مێزێك دانابوو تا گەشتیاران لە حاڵەتی پێویستدا كاغەزیان لەبەردەستدابێت. لاپەڕەیەك لەو یاداشتانەم كەوتە بەردەست، پێدەچووو مێژووەكەی بگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەسبەكاربوونی خوالێخۆشبوو و ئەم بابەتانەی تێدا یاداشت كرابوون:

3ی ئازار. گەڕانەوەی بەهاریی باڵندە كۆچەرەكان دەستی پێ كردووە: دوێنێ چەند دانە چۆلەكەم بینی. سلاوتان لێ بێ ئەی ڕۆڵە باڵدارەكانی باشوور! لە



جیكەجیكی شیرنتاندا ئاوازی گۆرانییەكی نەرم و ناسك دێتە خەیاڵم. هیوای شادی و خۆشبەختییتان بۆ دەخوازم، خۆشەویستەكان!).

14ی ئازار. ئەمڕۆ لە مارڤا یۆلامپییێڤنام پرسی: (( هۆی چیە كەڵەشێر ئەوەندە دەقوقێنێ؟)) وەڵامی دامەوە: ((لەبەرئەوەی ژێی هەیە)). منیش پێم گووت: (( ئێ خۆ منیش ژێم هەیە و بۆچی ناقوقێنم!)) . ڕاستیەكەی سروشت چەندە نهێنییاویە! كاتێ لە پترۆسبۆرگ خزمەتم دەكرد چەندین جار قەڵم خواردبوو بەلام تا دوێنێ قەلی زیندووم نەبینیبوو. باڵندەیێكی زیاد لە ئەندازە سەرنجڕاكێشە.

22 ی ئازار . سەرۆكی پۆلیس هاتبووە دیدارم. ماوەی دەمژمێرێك قسەمان لەباری كاروباری خێر و چاكە و ئاكاری جوانەوە كرد - من دانیشتبوو و ئەو بەپێوە - لە نێو قسەكانمان دا پرسی: ((ئەرێ بەڕاست بەڕێزم حەزناكەی تەمەنت بگەڕێتەوە سەردەمی لاوی؟)) وەلامم دایەوە نەخێر ئەگەر گەنج بام ئەم پلەوپایەی ئێستام نەدەبوو)). قسەكەمی سەلماند و لەكاتێكدا سەرسامبوون بەقسەكانمی پێوە دیاربوو، هەستا و ڕۆیشت.

16ی نیسان. لەنێو باخچەكەدا بە دەستی خۆم دوو پارچە زەویم كێلا و كردمە گەنم بۆ ساوەر. لەوبارەیەوە هیچم بە كەس نەگووت تا بۆ مارڤا یۆلامپییێڤنای خۆم - كە لە ژیاندا ساتەوەختی زیاد لە ئەندازە شیرنی پێ بەخشیوم - ببێتە دیاریەكی چاوەڕوان نەكراو. دوێنێ لە كاتی نانخواردندا دادوهاواری بوو لەدەست قەڵەویی و دەیگوت: (( ئەم ڕۆژبەڕۆژ قەڵەوبوونە ژیانی لێ تاڵ

کردووه و تەنانەت دەرگای عەمباری میوه و سەوزەکەشی لیٚ تەسك بۆتەوه.)).
لەوەلاٚم دا گووتم: (( بە پیٚچەوانەوه ئازیزەکەم، ئەم قەلْەویەت وایکردووه جوانتر بنویٚنی و وایکردووه زیاتر دلْبەندت بم)). ڕوخساری لەشەرمان سور هەلْگەڕا.
لە جیٚگای خۆم هەستام و بەهەردو دەستەکانم لە ئامیٚزم گرت - ئیدی وا قەلْەو بووه بەدەستیٚك لە ئامیٚز ناگیریٚ.
28 ی ئایار. پیرەمیٚردیٚك منی لە شویٚنی خۆشتن و مەلەی ژنان بینی و پرسی: ((ئەوه بۆ لیٚرە دانیشتوی؟ چ دەکەی؟)) وەلاٚمم دایەوه: (( هاتوم چاودیٚری ئیٚرە بکەم نەك گەنجەکان بیٚنە ئیٚرە و لیٚرەوه سەیری ژنان بکەن )). گووتی: ((دەکەوایە با پیٚکەوه چاودیٚریی بکەین)) ئەمەی گووت و هات لە تەنیشتم دانیشت و کەوتینە گفتوگۆ لەبارەی کاری چاك و ئاکار و ڕەفتاری جوانەوه)).

# بەرهەمی هونەریی

ساشا سمیرینۆڤ منالە تاقانە و خۆشەویستەکەی دایکی، لە حالێکدا کە شتێکی لە ژمارە 223 ی ڕۆژنامەی (هەواڵی بۆرسە) وە وەرپێچابوو و نابوویە بن هەنگڵی، خۆی کرد بە نۆڕینگەکەی دکتۆر کۆشلیکۆڤ دا. دکتۆر پێشوازی لێ کرد و گووتی:

- بەهـ بەهـ لەو گەنجە ماقوڵە! تەندروستیت چۆنە؟ چی تازە هەیە؟

ساشا چەند جارێك پێڵوەکانی لێکدان و دەستی خستە سەر سینگی و بە تۆنێکی تێکەڵ بە خرۆشانەوە گووتی: ئیڤان نیکۆلاێڤیج، دایکم سلاَوی لێ دەکردی و ڕایسپاردم بێمە خزمەتت و سوپاست بکەم ... من تاقانەی دایکمم و تۆ گیانی منت لە مەرگ ڕزگار کرد ... تۆ ئەو نەخۆشیە ترسناکەی منت چارەسەر کرد و ... ڕاستیەکەی من و دایکم نازانین بە چ زمانێك سوپاس و پێزانینی خۆمانت بۆ دەربڕین.

دکتۆر کە بە بیستنی ئەو وتانە هەستی بە چێژێکی زۆر دەکرد، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- بەسیەتی گەنجۆ! من وەك هەر دکتۆرێکی تر تەنیا ئەرکی خۆمم جێبەجێ کردووە.



- دەزانی کاکی دکتۆر، من تاقانە منالّی دایکمم ... ئەلّبەتە دەستمان کورتە و ناتوانین و بۆمان هەلّناسوڕێ حەقی ماندوێتیەکەت بدەین و ... کاکی دکتۆر، لەبەرئەوە زۆر شەرمەزارم، بەلاّم دایکم و من ... کە تاقانە منالّی دایکمم، سورین لەسەر ئەوەی کە ئەم شتە ناشایستەیەمان ... وەك سوپاس و پێزانێك ... لێ وەرگریت ... ئەم کارە شتێکی دانسقە و دەگمەنە و لە برۆنز دروستکراوە ... بەکورتی بەرهەمێکی هونەریی دەگمەن و لەمێژینەیە.

دکتۆر گنجێکی خستە ڕوخساری و گووتی:

پێویستی بەوە نەدەکرد! چ پێویستی بەوە دەکرد؟

ساشا کە سەرگەرمی هەلّپچڕینی بەستە پێچراوەکە بوو، لە ژێر لێوەوە بە مینگە مینگ گووتی:

- تکات لێ دەکەم ئەم دیاریەمان لێ وەرگرە ... ئەگەر لێمانی وەرنەگری من و دایەگیان لێت زویر دەبین ... کارێکی زۆر جوانە ... لە برۆنز دروستکراوە و زۆر لەمێژینەیە ... لە باوکی خوالێخۆشبوومەوە بۆمان ماوەتەوە و تا ئێستا وەك یادگاریەکی بەنرخ و خۆشەویست پاراستومانە ... باوکم شتی برۆنزی کۆنینەی دەکڕی و دەیفرۆشتەوە بەو کەسانەی حەزیان لەو جۆرە بەرهەمانە بوو ... من و دایەگیانیشم درێژە بەو کارەی وی دەدەین ...

پاشان شتەکەی لەنێو پارچە کاغەزە پێچراوەکە دەرهێنا و بە شکۆمەندیەوە خستیە سەر مێزەکە. ئەو شتە، مۆمدانێکی پێچکە کورتی لەمێژینە و کاری دەستی هونەرمەندێکی دەستڕەنگین و چازان بوو، کە لە لێکدان و تێکەڵ کردنی چەند پارچە پەیکەری جیاواز، دروستی کردبوو. بەسەر پێچکەکانی مۆمدانەکەوە، دوو ژنی ڕوت هەبوون کە بۆ گێڕانەوەی چۆنێتی و شێوازی ڕاوەستانیان نە زەوق و سەلیقەیەکی ئاگرینم هەیە، نە ئازایەتیەکی تەواو، پەیکەرەکان بەناز و کریشمەوە پێدەکەنین و بەگشتی قیافەیان بە شێوەیەك بوو

مرۆڤ وای هەست دەکرد هاتبا و وەك كۆڵەكەیەك ئەركی ڕاگرتنی مۆمدانەكەیان بە سەر شانەوە نەبا، بە دڵنیاییییەوە خۆیان فڕێ دەدایە خوارێ و لە ژوورەكەی دكتۆردا دەیانكردە سەما و بەزمێك كە وێنا كردنی ئەو دیمەنە لە مێشكیشدا دەبووە كارێكی دزێو و قێزەون.

دكتۆر چەند خولەكێك چاوەكانی بڕینە دیارییەكە، پاشان بەكاوەخۆ بناگوێی خوراند و كۆخەیەكی كرد و به دودڵیەوە ئاوی لوتی هەڵكێشایەوە و لەژێر لێوەوە بە مینگەمینگ گووتی:

- بەڵێ، لەڕاستیدا زیاد لە ئەندازە جوانە ... چۆن بڵێم ... تا ڕادەیەك لە شەرم بەدەر و بێ چاووڕووانەیە ... هاتبا و عەزییەیەكیشیان لەبەردا با بەهەر حاڵ، بەڵام بەم ڕوتوقوتیە ...

- ئێ چی تێدایە؟

- ئەمە نەیدەتوانی شتێكی دزێوتر و ناپەسندتر لەمە بئافرێنێ. دەترسێم ئەم كابووسە بخەمە سەر مێزەكەم قوڕم بۆ بگرێتەوە!

ساشا بەتۆنێكەوە - كە ڕەنجانی پێوە دیار بوو - گووتی:

- كاكی دكتۆر بەڕاستی تێڕوانینەكانت بۆ هونەر سەیروسەمەرەن! فەرموو لێی بڕوانە، ئەمە بەرهەمێكی هونەرییە! هێندە هونەر و جوانی و ڕازانەوەی تێدا بەكارهاتوە مرۆڤ بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ هەست بە ڕێز دەكات بەرامبەری و فرمێسك هەناسەی دەگرێ! مرۆڤ لەسەیركردنی ئەو هەموو جوانییە دونیای بەتەواوی بیر دەچێتەوە ... لێی بڕوانە، لێوانلێوە لە جوڵە و ڕازانەوە و كۆكراوەیەكە لە كاری باڵا و توانای بەرز و ئارەزوو!

دكتۆر قسەكانی پێ بڕی و گووتی:

- لە هەموو ئەو قسانە تێدەگەم، بەڵام خۆشەویستم من خاوەنی ماڵ و مناڵم، مناڵەكانم بەردەوام دێنە ژوورەكەم، خاتونی بەڕێز بەڕێز دێنە لام ...



- ئەڵبەتە ئەگەر بمانەوێ بە چاوی كەسێكی ئاساییەوە بڕوانینە بەرهەمێكی ئاوا، ئەوە شتێكی ترە ... بەڵام دكتۆر گیان دەبێ بەڕێزت لە ئاستێكی باڵاترەوە بڕوانی و تێڕوانینێكی جیاوازترت هەبێ. ئەگەر ئەم دیاریەمان لێ وەرنەگریت بەڕاستی من و دایەگیانم لێت زویر دەبین. ئاخر من تاقانەی دایكمم ... تۆ منت لە مەرگ ڕزگار كردووە ... ئێمە بەنرخترین و خۆشەویستترین شتی خۆمان بەدیاری بۆ هێناوی و ... بەداخەوە كە تاكەكەی ترمان نەبوو ئەگینا هەردوكیانم پێشكەش دەكردی ...

- سوپاست دەكەم ... سڵاوم بە دایكت بگەیەنە بەڵام وەرە خۆت ببە دادوەر و بڕیار بدە: مناڵەكانم كاتوساتیان نییە و بەردەوام دێنە ژورەكەم، خاتونەلی بەڕێز دێنە لام ... بەڵام چی بكەم، مادام ئەوەندە پێداگر و مكوڕی چارنییە لەوێ داینێ! ماشەڵا خۆ دەس هەڵناگری!

ساشا بە شادیەوە وەڵامی دایەوە:

- هۆكارێك نابینم بۆیە دەس هەڵناگرم. پێم باشە لەوێ لە تەنیشت ئەو گوڵدانەوە دایبنێی. بەداخەوە، كە تاكەكەی ترمان نەبوو! بەداخەوە! ئێستا ئەگەر مۆڵەت هەبێ من دەڕۆم. خوداحافیز!

هەركە ساشا چووە دەرێ، دكتۆر تا ماوەیەك لە مۆمدانەكەی ڕوانی و دواتر بناگوێی خوراند و بەخۆی گووت: ((بێگومان كارێكی دانسقە و ناوازەیە و حەیفە فڕێی بدەم ... لەلایەكی تریشەوە هێشتنەوەشی كارێكی جوان نییە ... هم ... مەسەلەیەكی ئاڵۆزە! چۆنە بەدیاری بیدەم بە یەكێك لە ئاشناكانم؟ بەڵام بیدەمە كێ؟)). ماوەیەك بیری كردەوە و لەناكاو یەكێك لە ناسیاوە باشەكانی بیركەوتەوە - ئۆخۆڤی پارێزەر كە ماوەیەك لەوەپێش لە بری ئەم ئەركی ڕاپەڕاندنی كارێكی وەئەستۆ گرت و لە پای ئەو كار و ماندووبوونەشی هیچی لێ وەرنەگرت. بیری كردەوە: ((بەخوا فیكرێكی باش بوو! مادام ئەو بەهۆی

ئاشنایەتییەوە پارەی لێ وەرنەگرتم منیش ئەو مۆمدانەی بە دیاری دەدەمێ. ئەو بەرهەمە شەیتانیییەی پێ دەبەخشم و لەکۆڵ منیش دەبێتەوە! ئەویش هەم ماڵ و منداڵی نییە و هەم زۆریشی پێ خۆش دەبێ ... )).

دکتۆر بە پشتبەستن بەو وتەیەی کە دەڵێ کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەی، بێ دواکەوتن جلوبەرگەکانی کردە بەر و مۆمدانەکەی هەڵگرت و چووە دەرێ.
پارێزەر لە ماڵ بوو و گووتی:
- سلاو ئاشنای خۆشەویست! هاتوم سوپاسی ئەو ماندوبوونەت بکەم ... ئێستا کە ئامادە نیت پارەم لێ وەرگری لانیکەم ئەم مۆمدانەم بە دیاریی لێ وەرگرە ... کارێکی جوان و بێ هاوتایە!
ئۆخۆڤ بە بینینی مۆمدانەکە زۆر خۆشحاڵ بوو و بە قاقای پێکەنینەوە گووتی:
- چ مۆمدانێکی سەرنجڕاکێشە! نەفرەت لە شەیتان سەیرکە چییان دروست کردووە! بێ هاوتایە! کارێکی بالاَیە! سەیرە! ئەم شتە جوانەت لەکوێ پەیدا کردووە؟
بەلاَم دوای پیاهەڵدان و ستایش کردنی مۆمدانەکە، بە حاڵەتێکی تێکەڵ بە ترسەوە سەیرێکی دەرگاکانی ژورەکەی کرد و لێی زیاد کرد: نا برا، ئەم دیاریە بۆ خۆت. من ناتوانم قبووڵی بکەم ...
دکتۆر بە ترس و شپرزەییەوە پرسی:
- بۆ؟
- ئەی دایکم و ئەو کەسانەی کاریان دەکەوێتە لام؟ چییان وەلاَم بدەمەوە؟ تەنانەت لەڕوم نایە لە ئاست خزمەتکارەکانیش سەر بەرز کەمەوە ...
دکتۆر دەستی ڕاوەشاند و گووتی:



- ئەم قسانە چین؟ تۆ مافی ئەوەت نییە دیاری من ڕەت کەیتەوە! ... لێت زویر دەبم! ئەمە کارێکی هونەرییە ... بەرهەمێکی لێوانلێو لە جوڵەیە و کارێکی سەرنجڕاکێشە ... ئیدی پێویست بەوە ناکا قسەی لەبارەوە بکەی ... گەرنا زویر دەبم!
- ئەگەر ڕەنگێکی تۆخ و تاریکیشیان کردبا یان چەند گەلاَ هەنجیرێکیان بە هەندێك شوێنییەوە لکاندبا بەهەرحاڵ ... بەلاَم ئاوا ...
بەلاَم دکتۆر بە قۆڵبادانێکی زیاترەوە و لە ماڵی ئۆخۆڤ وەدەرکەوت و دڵنیا لەوەی کە مۆمدانەکە جێگای خۆی گرت، گەڕایەوە ماڵێ ...
کاکی پارێزەر دوای ڕۆیشتنی دکتۆر، دانیشت و کەوتە سەیرکردنی مۆمدانەکە. چەند جارێك دەستی پێدا هێنا و چەشنی دکتۆر کۆشلیکۆڤ کەوتە بیرکردنەوە:
((چی لەمە بکەم؟ کارێکی زیاد لە ئەندازە جوانە و پێم حەیفە فڕێیدەم لەلایەکی تریشەوە هێشتنەوەشی مایەی دەردەسەریە. وا باشە بیبەخشم بە کەسێك ... وا باشە هەر ئەمشەو بیدەمە شاشکینی هونەرمەندی کۆمیدی. ئەو هونەرمەندە نەفرەتیە زەوقی بەم خرتکە و پرتکانە دێت ... لەو نێوەشدا، دەرامەتی نمایشی ئەمشەویش لەبەرژەوەندی ئەو دایە ... )).
وەك دەڵێن: هەر ئەوەیە و بڕایەوە!

هەر ئەو شەوە، مۆمدانە لە کاغەز پێچراوەکە بە دیاری درایە هونەرمەندی کۆمیدی. ئەو شەوە پیاوان وەك مێروولە، دەستە دەستە داباریینە ژووری ئارایش و مکیاژی شاشکین تا لە بینینی مۆمدانەکە بێبەش نەبن. دەنگی پێکەنین و هاتوهاواری شادییان - کە حیلەی ئەسپیان وەبیر مرۆڤ دێنایەوە - ساتێك چیە نەدەبڕایەوە. هەرجارەی کە ئەکتەرێکی ژن لە دەرگای ژورەکەی شاشکینی دابا

و پرسیبای : مۆڵەت هەیە؟ دەنگی نوساوی شاشکین دەهاتە بەرگوێیان و بێ دواکەوتن وەڵامی دەدایەوە:

نا نا بەڕێزم هێشتا خۆم لەبەر نەکردووە!

شاشکین دوای کۆتایی هاتنی نمایشەکە لەحاڵێکدا شانەکانی هەڵدەتەکاند و دەستەکانی ڕادەوەشاندن، گووتی: ئاخر ئەم شتە پیسە بە کەڵکی چی من دێت؟ کابرای کڕێچی کوا دەتوانێ ئەم شتانە لە ژورەکەی خۆی دابنێ! خۆ ناکرێ لەبەر مۆمدانێك دەرگای ژورەکەم بە ڕووی خەڵکیدا داخەم! زۆرێك لە هونەرمەندە ژنەکان دێنە ئاپارتمانەکەم و هاتوچۆیان هەیە، ئەگەر وێنەیەکیش بووایا بەهەرحاڵ ... دەمخستە نێو چەکمەجەی مێزەکەم و دەبڕایەوە، بەڵام ...

ئەو هونەرمەندەی کە سەرگەرمی سڕینەوە و پاککردنەوەی ڕوخساری شاشکین بوو، ڕێنمایی کرد:

- بیفرۆشە کاکە ... لەقەراخ شار پیرەژنێك هەیە کاری کڕین و فرۆشتنی ئەو جۆرە شتە برۆنزیی و کۆنانە دەکا، زۆر دوریش نییە. برۆ ئەوێ و پرسیار بکە ماڵی سمیریۆنۆڤ لەکوێیە پێت دەڵێن ... خەڵك هەموو دەیناسن.

شاشکین ڕێنماییەکانی ئەوی جێبەجێ کرد و مۆمدانەکەی لەکۆڵ خۆی کردەوە ...

دو ڕۆژ دواتر، دکتۆر کۆشلیکۆڤ لە نۆڕینگەکەی خۆی دانیشتبوو و پەنجەکانی نابوو بە لاسەریەوە، بیری لە جۆرەکانی ئەسیدی سەفراوی دەکردەوە. لەناکاو دەرگا کرایەوە و ساشا سمیرینۆڤ بە هەڵەداوان خۆی بە ژورێدا کرد. بە زەردەخەنەوە، ڕوخساری دەتروسکایەوە و خۆشیی بە سەرتاپای بالآیەوە بەدی دەکرا ... بستەیەکی لە ڕۆژنامە پێچراوی بەدەستەوە بوو، بە هەناسەبڕکێوە گوتی:



- کاکی دکتۆر نازانی چەندە خۆشحاڵم! باوەڕت هەبێ لە بەختی جەنابتەوە بوو کە تاکە مۆمدانەکەی ترمان پەیدا کرد! ... دەزانی دایکم چەندە خۆشحاڵ بوو بە دەسکەوتنی تاکەکەی تر ... دەزانی من تاقانە منداڵی دایکمم ... تۆ منت لە مەرگ ڕزگار کردووە ...

ساشا، کە لەخۆشیان سەرتاپای دەلەرزی، مۆمدانەکە دانایە سەر مێزەکە. دکتۆر کۆشلیکۆڤیش دەمی کردەوە شتێك بڵێ ، بەڵام نەیتوانی هیچ بڵێ چوونکە زمانی گیرابوو.

# شةويَك بةر لة دادطايي

گالیسکەڕانەکە ڕووی کردە من و بە قامچییەکەی دەستی، کەروێشکێکی - کە بە هەڵبەزهەڵبەز و قونە قون بە جادەکەدا تێدەپەڕی - نیشاندام و گووتی:
- نیشانەی شومییە گەورەم ... دەترسێم بەڵایەکمان بەسەربێ!
من بەبێ بینینی کەروێشکیش دەمزانی ئایندەیەکی پڕ لە داخ و ژان چاوەڕوانمە. ئەو ڕۆژە کەوتبوومە ڕێ دەچوومە دادگای شارۆچکەی (C) تا بە تۆمەتی فرەژنی بچمە شوێنی تۆمەتباران و دادگایی بکرێم. کەشوهەوایەکی ترسناکی هەبوو. بەشێوەیەك سڕ ببووم و بەشێوەیەك تەڕ ببووم و بە شێوەیەك لە هەڵبەز و دابەزی یەکڕیتمی گالیسکەکە گێژ ببووم کە کاتێ گەیشتمە پۆستخانە (چاپارخانە) بە مرۆڤێك دەچووم سەرتاپای جەستەیان بە توێژێك بەفر داپۆشییێ و دواتر ئاوی ساردیان کردبێ بە سەری دا و لە تەختەی شەلاق لێدانیان بەستییێ. سەرپەرشتیاری پۆستخانەکە - پیاوێکی بالآبەرز و سەرلوس و خەواڵو، بە بیجامەیەکی خەتخەتی دەلنگ درێژ و سمێڵێکەوە کە دەتگوت لە کونەلوتی ڕواون و هاتونە دەرێ و ببوونە بەربەستی بۆن کردنی - پێشوازی لێ کردم.



لە پۆستخانە، جا بۆنی چی لێ نەدەهات! کاتێ سەرپەرشتیارەکە هاتە پێشوازیم و ئەودەمەی کە بە فینگەفینگ و پرتە و بۆڵەوە دەرگاکەی لێ کردمەوە و بەدەم خوراندنی پشتەملییەوە و بێ ئەوەی ورتەی لە دەم دەربێ، بە ئاماژەی دەست ((ژوور)) ەکەمی واتا ئەو شوێنەی کە دەبووایا شوێنی پشودانم بێ، نیشان دام و بۆن بۆگەنی و مەگەز و سیسرکەی پلیشاوە وەها لە نێو لوتمدا پێچی خوارد، وەختبوو بخنکێم. چرا نەوتیەکەی سەر مێزەکە کە ڕوناکایی دەپڕژاندە سەر دیوارە دارینییە ڕەنگ نەکراوەکەی ((ژوور)) ەکە، چەشنی چراڕەشکە دوکەڵی دەکرد. وەژوورکەوتم، جانتاکەم لەسەر مێزەکە دانا و گوتم:
- ئێرە چ بۆنێکی ناخۆشی لێدێ سینیۆر!
کابرا، بۆنی بە هەوای ژوورەکەوە کرد و سەرێکی لە ڕووی گومان و باوەڕنەکردنەوە بادا و دەستی خوراند و گووتی:
- ئاساییە، هیچ بۆنی لێ نایەت کاکە. لە هەوای ساردی دەرێڕا هاتویە ژوورێ بۆیە واهەست دەکەیت بۆنی لێ دێت. گالیسکەڕانەکان لە نێو تەویلەکە وەك بەرخ لێی دەنون.
بەڕێمکرد و خۆشم کەوتمە سەیرکردنی مەنزڵە کاتییەکەم. ئەو کاناپەیەی کە بڕیاربوو لەسەری بنوم، بە ئەندازەی جێگاخەوێکی دوو کەسیی پانوپۆڕ و لە هەمان کاتیشدا بەرگە موشەماکەی وەك بەفر سارد بوو. جگە لە کاناپەکە زۆپایەکی گەورەی چەدەنی، مێزێك، ئەو چرایەی کە باسمان کرد، جوتە چەکمەیەکی لبادیین، جانتایەك، لادیوارێك کە بەشێك لە ژوورەکەی پێ جیا کرابۆوە، دەکەوتنە بەرچاو. لەودیوو دیوارەکەوە، کەسێك لە خەوێکی ئاسودە دابوو. دوای ئەوەی لەسەیرکردن بوومەوە، جێگاخەوەکەم لەسەر کاناپەکە ڕاخست و کەوتمە دانانی جلەکانم. زۆری نەخایاند لوتم بە بۆنی پیسی و بۆگەنی ژوورەکە ڕاهات. چاکەت و پانتۆڵ و چەکمەکەم دانا و لەکاتێکدا کە خۆم

دەکێشایەوە و زەردەم دەهاتێ و موچڕکە بە جەستەمدا دەهات و بە پێخواسی
بە دەوری زۆپا چەدەنییەکەدا دەسوڕامەوە، کەوتمە هەڵپەڕین ... ئەم هەڵبەزینەوە
و هەڵپەڕینە وای کرد زۆر زوو گەرم ببمەوە. ئیدی هیچ کارێکم نەبوو جگە
لەوەی ڕاکشێم و بنوم بەڵام لەم کاتەدا پێشهاتێکی بچووك و لەهەمان کاتدا
سەیر، ڕویدا.
ڕوداوەکە ئەوەبوو کە لەناکاو چاوم بە دیوارەکە کەوت و ... ئەستەمە بتوانی ئەو
ترسەی کە لەو کاتەدا بە سەرمدا زاڵ بوو لە مێشکی خۆتدا وێنای بکەی!
سەری بچکۆلەی ژنێك، بە قژی شۆڕبووەوە و چاوانی بچووك و ڕەش و ددانی
ورد و بەرچاوەوە، لەودیو پەردەکەوە لێی دەڕوانیم. برۆ ڕەشەکانی دەلەرزین،
چاڵە جوان دڵفڕێنەکانی سەر گۆنای هێندە بە مکوڕی و بەهێزییەوە سەمایان
دەکرد - دەتگوت پێدەکەنێ. شەرمەزار و دەستەپاچە بووم. کاتێ سەرە
بچووکەکە هەستی کرد بینیومە دەستوپێی خۆی ون کرد و خۆی لێ ون کردم
و لە بەرچاوان ون بوو. چەشنی گوناهکاران چاوم بڕیە زەوی و بێدەنگ و ئارام
بەرەو کاناپەکە چووم و لێی ڕاکشام و خۆم خزاندە ژێر باڵتۆ چەرمینەکەم.
کەوتمە بیرکردنەوە: ((چ ڕێکەوتێکی سەیرە! لەوانەیە ئەو هەڵپەڕین و هەڵبەز و
دابەزەی منی بینیبێ! ئای کە شتێکی خراپ بوو!)).
ئەدگاری ئەو ڕوخسارە دڵبزوێنەم هێنایەوە خەیاڵ و بێ ئەوەی بەخۆم بزانم مەلی
خەیاڵم کەوتە فڕین. دیمەن لە دیمەن جوانتر و بزوێنەرتر لە مێشکمدا
کۆدەبوونەوە و ... لەناکاو ئازارێکی وەك سوتانم لە گۆنای چەپم دا هەست
پێکرد - دەتگوت ئەمە سزای ئەو بیرکردنەوە و ئەندێشە ئالودە بە گوناهانەم
بوو. دەستم بۆ برد بەڵام هیچم بەردەست نەکەوت بەڵام هەرچۆنێك بێت، درکم
بە گرفتەکە کرد: بۆنی مەگەز و سیسرکەی پلیشاوە لووتی پڕ کردم. وە لەو
کاتەدا دەنگی شیرنی ژنەم لە پشت پەردەکەوە هاتە بەرگوێ:



- تو خوا ئەمە ژیانە! بەدەست ئەم مێشولە نەفرەتییانەوە! خەریکە دەمانخۆن!
- هم! ... کەوتمەوە یادی خوە چاکەکەی خۆم: وا ڕاهاتووم بچمە هەر شوێنێ
گوڵە حاجیلەی کوتراو لەگەڵ خۆمدا دەبەم. ئەمجارەش بیرم نەچووبوو و لەگەڵ
خۆمدا هێنابووم. لە چاولێکنانێکدا قتوی گوڵە حاجیلەکەم لە جانتاکەم
هێنایە دەرێ. هیچ کاری ترم نەبوو جگە لەوەی کە ئەم (ئامرازی دژە مێشولە)
یە بخەمە خزمەت ئەو سەرە جوانە و ... دەرگای ئاشنایەتیی لەگەڵدا بکەمەوە.
بەڵام چۆن بیدەمێ؟ دەنگی ژنە جارێکی تر لەوسەری پەردەکەوە هاتەوە
بەرگوێیان:
- ئای کە ترسناکە!
تا ئەو شوێنەی دەمتوانی بە دەنگێکی شیرنەوە گووتم:
- خاتونی بەڕێز، لە داد و هاوارتەوە دیارە مێشولە تەنگیان پێ هەڵچنیوی ...
من گوڵەحاجیلەی کوتراوم لایە. ئەگەر حەزت لێیە دەتدەمێ ...
- ئاه، توخوا بمدەرێ!
بە شاگەشکەبوونەوە گووتم:
- کەوابێ ... هەرئێستا ... باڵتۆ چەرمەکەم لەبەردەکەم و دەیهێنمە خزمەتت ...
- نا، نا ... هەر لە سەر دیوارەکەوە بمدەرێ. مەیە ئێرە!
- خۆم دەزانم کە دەبێ لەسەر دیوارەکەوە بتدەمێ. مەترسە: مرۆڤێکی هێندە
بێسەرەوبەرە نیم ...
- چووزانم ئەو گەشتیار و شتانە ...
- هم ... دامنا هاتمە ئەودیو دیوارەکەش ... چی تێدایە؟ ...
پاشان بە درۆ لێم زیاد کرد:

- بەتایبەتی کە من دکتۆرم و وەك خۆشت دەزانی دکتۆر و پیاوانی ئاسایش و ڕازێنەرەوەی ژنان و ئەمانە مافی ئەوەیان هەیە زانیارییان لەسەر ژیانی تایبەتی خەڵك هەبێ.

- تۆ دکتۆریت؟ بەڕاست؟ بەڕاستیتە؟

- بەشەرەفم بەڕاستمە! ئێستا مۆڵەت هەیە گوڵە حاجیلە کوتراوەکە بێنمە خزمەتت؟

- مادام دکتۆریت قەیناکا ... بەلاّم بۆ تۆ ئەزیەت بکێشی؟ ئێستا مێردەکەم دەنێرم ...

دواتر بە هێواشی درێژەی پێدا:

- فیدیا! فیدیا! هەستە تەوەزەل! هەستە برۆ ئەودیو پەردەکە! ئەو دکتۆرە بەڕێزە فەرموی گوڵە حاجیلەی کوتراوتان دەدەمێ، برۆ لێی وەرگرە.

بوونی فیدیا لەودیو دیوارەکە، هەواڵێکی ناخۆش و ورکەر بوو بەلامەوە، وەك ئەوەی ئاسمانم بەسەردا ڕوخابێ ... هەستێکی ناخۆشی وەك دوای گیربوونی فیشەك لە تفەنگدا: هەم شەرمەزاری، هەم نیگەرانی، هەم پەژارە، بەسەرمدا زاڵ بوو ... زۆر تێکچووم و کاتێ بەڕێز فیدیا لە پشت دیوارەکەوە دەرکەوت هێندە ناکەسبەچە و بەدکار هاتە بەرچاوم حەزم دەکرد هاوار بکەم: (( ئەی هاوار فریام کەون!)). فیدیا پیاوێکی بالاّبەرز و دەمارەکانی ملی دیار بوون و تەمەن نزیکەی پەنجا ساڵ و سەروریشی ماش و برنجی و جستەیەکی تێکسمڕاوی کارمەندانە و لوت و لاملی پڕ لە دەماری ڕەنگ شین و ناسك بوون. ڕۆبێکی لەبەر و سۆلێکیشی لەپێ دابوو. گوڵە حاجیلە کوتراوەکەی لێ وەرگرتم و بەدەم گەڕانەوەوە گووتی:

- جەنابی دکتۆر، تۆ مرۆڤێکی میهرەبانی ... سوپاس ... دەڵێی تۆش توشی زریان و وەیشومە هاتوی و ئاوا لە درێژەدان بە گەشتەکەت کەوتوی؟



من کە خەریکبوو لەسەر کاناپەکە ڕادەکشام و بە ڕقەوە خۆم دەخستەوە ژێر باڵتۆ چەرمینەکەم، بە نابەدڵییەوە وەلاّمم دایەوە:

- بەڵێ!

- ئاوا ... زینا خۆشەویستم، مێشولەیەك بە سەری لوتتەوەیە ڕاوەستە با بەریدەمەوە.

زینا بە پێکەنینەوە وەلاّمی دایەوە:

- دە بەریدەوە! دیسانەوە نەتتوانی! کارمەندی پایەبەرز! هەموو خەڵك لێی دەترسێن و کەچی توانای بەرانبەرکێی مێشولەیەکی نییە!

- زینا خۆشەویستم، ئاگاداربە پیاوێکی نەناس لەودیوە و گوێی لە قسەکانت دەبێ ... (ئاهێك هەڵدەکێشێ ) بەخوا تۆ ... بەخوا کە ...

منیش لەم دیوەوە کە هیچ سەرم لە هۆکاری توڕەبوونی خۆم دەرنەدەکرد، لە بەرخۆمەوە بە ڕق و نەفرەتەوە بۆلاّندم:

- ئەی بەرازە پیسەکان! خۆ لێ ناگەڕێن مرۆڤ بنوێ!

بەلاّم ژن و مێردە زۆر زوو بێدەنگ بوون. بۆ ئەوەی خەوم لێ بکەوێ، چاوم داخست و هەوڵمدا بیر لە هیچ شتێك نەکەمەوە. نیو دەمژمێر تێپەڕی و پاشان نیو دەمژمێری تریش تێپەڕی ... خەو لە چاوم نەکەوت. لەم کاتەدا دەنگی ئەمدیو و ئەودیو کردن و پرتە و بۆڵەی ئارام و بەسرتەی هاوسێکانم لەودیو پەردەکەوە هاتە بەرگوێ. فیدیا بە ڕق و قینەوە دەیگوت:

- سەیرە تەنانەت گوڵە حاجیلەی کوتراویش کاریگەری نییە ... یەکجار مێشولەی زۆرە.

دواتر بە دەنگێکی بەرزتر ڕوو بە من گووتی:

- کاکی دکتۆر! زینا گیان داوای لێ کردم لێت بپرسم : بۆچی بۆنی مێشولە و سیسرکە ئەوەندە بێزارکەرە؟

**بەمشێوەیە دەرگای وتوێژ لەنێوانماندا کرایەوە. ئیدی لەبارەی مێشولە و کەشوهەوا و زستانی ساردوسڕی ڕوسیا و بوواری تەندروستی و پزیشکی - ئەو بووارەی کە چەندە سەرم لە ئەستێرەناسی دەردەکرد لەویش هەر ئەوەندە - و هەروەها لە بارەی ئەدیسۆنەوە دواین ... دوای ئەو قسانەی کە لەبارەی ئەدیسۆنەوە کردمان، لەو دیوو دیوارەکەوە گوێم لە سرتەی فیدیا بوو کە دەیگووت:**

**- زینا، ئازیزەکەم، شەرم مەکە ... شەرم بخە ئەولاوە و لێی بپرسە ... خۆ ئەمە شەرم و ترسی ناوێ! شرۆتسێڤ هیچ چارەسەرێکی تۆی پێ نەکرا ، کێ دەڵێ ئەم دکتۆرە شتێکی پێ ناکرێ!**

**زیناش بە سرتەوە وەڵامی دایەوە:**

**- لەڕووم هەڵنایە، خۆت لێی بپرسە!**

**دواتر فیدیا لێی پرسیم:**

**- کاکی دکتۆر، خانمەکەم هەندێك جار تووشی تەنگەنەفەسی و دڵەکوتێ دەبێ. دەبێ هۆکاری چ بێ؟ کۆخە ... دەزانی ... وەك ئەوەی شتێك لە سینەی دا هەڵدڕێ ...**

**هەوڵم دا خۆم لە وەڵامەکەی دوابخەم.**

**- کاکە ئەم دیاردەیە ڕاڤە و شرۆڤەی زۆری دەوێ و ناکرێ بە چەند وتەیەکی کورت ڕوون بکرێتەوە ...**

**- ئێ با زۆریش بێ چیە! تا بەیانی کاتمان لەبەردەستە ... تکا دەکەم سەیرێکی بکە. بۆ زانیاری بەڕێزیشت ئەو دکتۆرەی کە زینا سەردانی دەکا دکتۆر شرۆتسێڤە ... پیاوێکی زۆرباشە بەڵام ... کێ دەزانێ؟ من هیچ باوەڕم پێی نییە! دیارە کە ماندو و بێ توانایت بەڵام تکات لێ دەکەم سەیرێکی بکە ... تا تۆ سەیرێکی دەکەی منیش دەچم و پێیان دەڵێم سەماوەرەکە داگیرسێنن.**



**فیدیا لە حاڵێکدا کە دەنگی خشەخشی سۆڵەکەی دەهات، وەدەرکەوت. چووومە ئەودیو دیوارەکە. زینا گیان لەنێو گەمارۆی کۆمەڵێك باڵنج و پشتیی و لەسەر کاناپەیەکی گەورە دانیشتبوو و یەخە تۆڕئاساکەی بە گەردەنییەوە گوشیبوو. لەتەنیشتی دانیشتم. گنجێکم کردە تەوێڵم و گووتم:**

**- زمانت دەربێنە!**

**زمانی دەرهێنا و پێکەنی. زمانی سور و ئاسایی بوو؟ مەچەکیم گرت و بەڵام نەمتوانی نەبزی بدۆزمەوە. بە تۆنێکی درێژکراوەوە لە ژێرلێوەوە گووتم:**

**- هم!**

**باش بیرم نەماوە ئەوکاتەی کە چاوم بڕیبووە قیافەی، چ پرسیارەلی ترم لێ کرد! بەڵام ئەوەندەم لەبیرە کە دوای سەیرکردن و پشکنین و دیاری کردنی نەخۆشیەکەی، وا گێژ ببووم توانا و حەوسەلەی دۆزینەوەی پرسیاری ترم نەبوو. سەرەنجام، لە تەنیشت فیدیا و زینا گیان و ئەو سەماوەری کە خەریکبوو وەکوڵ دەهات دانیشتم، کەوتمە نوسینی ڕەچێتە، ئەویش بە پێی ئەندازە و سەنگی زانستی پزیشکیی دەمنوسی، بەم چەشنە نوسیم:**

rp, sictransit0.05
glorio mundi 1.0
aquae destilatae 0.1

**دو کاتژمێر جارێ، یەك کەوچکی شۆربا**
**بۆ خاتوو سیالۆڤا**
**دکتۆر: زایتسێڤ**

سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر کە بە خۆم و جانتاکەی دەستمەوە ئامادەی ڕۆیشتن بووم حەزمکرد خواحافیزی هەمیشەیی لە ئاشنا تازەکانم بکەم، فیدیا لە حاڵێکدا کە دوگمەی چاکەتەکەی گرتبووم، دە ڕۆبڵییەکی بۆ درێژ کردم و بە تۆنی دەنگێکی ڕازیکەرانەوە گووتی:
- دەبێ ئەم پارەیەم لێ وەرگریت! من وا ڕاهاتوم هەقی هەموو کارێکی شەرافەتمەندانە بدەم! ئەمە، هەقی ئەو زەحمەتیانەیە کە لەگەڵ ئێمەدا کێشات! تۆ ئەو زانست و زانیاریانەت بە نرخی خوێن و ئارەقە وەدەست هێناوە! من خۆم باش لەم شتانە حاڵی دەبم!
ناچار دە ڕۆبڵەکەم وەرگرت.
ئەمەبوو ڕوداوی شەوی بەر لە دادگایی کردنەکەم.
پاشان کە چوومە دادگا و ئەو دەمەی کە دەرگای هۆڵی دادگایی کردنیان لێ کردمەوە و کارمەندی جێبەجێکاری دادگا شوێنی تۆمەتبارانی نیشاندام، بوومە یەخسیری هەستێك کە لێرەدا نامەوێ هیچ شیکردنەوەیەکی لەسەر بکەم و لەبارەیەوە بدوێم. تەنیا ئەوەندە بەسە کە بڵێم کاتێ سەیری دواوەی خۆم کرد، هەزاران چاوم بینی لێیان دەڕوانیم، ڕەنگم لەبەردا نەما و شەرمەزار و دەستەپاچە بووم. کاتکیش سەیری قیافەی جدی و پڕ لە شکۆی دەستەی دادوەرانم کرد، فاتیحای خۆمم خوێند ...
زمان لە ئاست گێڕانەوەی ئەو ترس و سامەی کە لەگەڵ بینینی دەستەی دادوەران توشم هاتم، لاڵە. دەزانی کێ لە شوێنی داواکاری گشتی دانیشتبوو؟ فیدیا! دانیشتبوو و سەرگەرمی نوسین بوو. سەیرێکم کرد و مێشولە و سیسرکەکان و زیناگیان و پیشەی دکتۆریم بیرکەوتەوە و لەوکاتەدا وام دەزانی نەك هەر سەرما و ساردوسڕیی، بگرە هەرچی بەفری بەستەڵەکی جەمسەری باکور هەیە لەسەر پشتی منە ... فیدیا لە نوسین کەوت و سەیرێکی منی کرد.



سەرەتا نەیناسیمەوە، دواتر ڕەشێنەی چاوی کرایەوە و هەموو شتەکانی بیرکەوتنەوە ... دەستەکانی دەلەرزی. بە ئارامی هەستا و چاوە سورهەڵگەڕاوەکانی تێ بڕیم و منیش بێ دەلیل لەوم ڕوانی ... سەرۆکی دادگا دەستی پێ کرد:
- تۆمەتبار، خۆت بناسێنە!
داواکاری گشتی دانیشت و پەرداخێك ئاوی خواردەوە. ئارەقەیەکی سارد بە تەوێڵیەوە نیشتبوو. بیرم کردەوە: (( کارم تەواوە! بابم لەگۆڕ دەردێنی!)).
وێدەچوو فیدیا لەسەر ئەوە مکوڕ بێ بمخاتە زیندانەوە. لە تەواوی کاتی دادگاییکردنەکەدا، ڕقی پێوەدیار بوو، توڕە دەبوو، خۆی دێنا و دەبرد و ...
ئێستا کاتی ئەوەیە کۆتایی بە چیرۆکەکەم بێنم، ئەم دێڕانە لە نێو باڵەخانەی دادگا و لە کاتی پشوی نیوەڕۆی دادگا دا دەنوسم ... و چەند خولەکێکی تر، کاکی داواکاری گشتی، دەست بە بەرگری لە سکالانامەکە دەکا. بە بۆچوونی ئێوە سەرەنجامەکەی چۆن دەبێ؟

# ئانا بة طةردةنةوة

1

دوای کۆتایی هاتنی مەراسیمی مارەکردن، تەنانەت مەزەش لەسەر مێزەکە نەمابوو چ بگا بە خواردەمەنیی. بووك و زاوا، یەکی پێکێك شەرابیان نۆش کرد. دواتر لیباسەکانیان گۆڕی و بەرەو وێستگەی ڕێگای ئاسن وەڕێ کەوتن. لەبری ئاهەنگی گواستنەوە و بانگێشت کردنی ئاشنایان بۆ نانی ئێواریّ و نەوای موزیك و سازدانی کۆڕی سەما بڕیاریان دابوو بچنە زیارەتی پەرستگایەك، ئەویش پەرستگایەکی دوور بەئەندازەی دووسەد ڤرست! زۆر کەس ستایشی ئەم بڕیارەی ( میدیست ئەلیکسییچ ) یان کرد و دڵنیابوون لەوەی کە سازدانی ئاهەنگی گواستنەوەی پڕ لە هاتوهاوار و هەراوزەنا بۆ پیاوێك کە هەم خاوەنی پلە و پایەیە و هەم تەمەنێکیشی ڕابواردوە، کارێکی شیاو نییە. جگە لەمەش سازدانی کۆڕی موزیك و سەما لە مەراسیمی زەماوەندی کارمەندێکی پەنجاودوو ساڵە و کچێك کە هێشتا هەژدە ساڵی تەواو نەکردووە، جگە لە نمایش کردنی دیمەنێکی خەمناك، هیچی تر نییە. دەنگۆ هەبوو بیرۆکەی گەشت بۆ پەرستگا هی زاوا بێت کە پیاوێکی زۆر پابەند بوو بە دابوونەریتەکانەوە بۆئەوەی بە هاوسەرە گەنجەکەی بسەلمێنی کە لە ژیانی ژن و



مێردایەتیان دا، مەعنەویات و بیروباوەڕی ئاینیی، بایەخ و گرنگیەکی زۆریان هەیە لەلای.

بووك و زاوایان تا وێستگە بەڕێ کرد. چەند کەسێك لە خزمان و هاوکارانی فەرمانگەکەی خۆی، بە پێکی شەرابەوە ڕاوەستا بوون و چاوەڕوانی بەڕێکەوتنی شەمەندەفەرەکە بوون تا بیکەنە هەڵهەڵە لێدان و هاتوهاوار. لەم نێوەدا ( پیوتەر لیۆنتیچ ) ی بابی بووکێ بەکڵاوی ڕەنگاوڕەنگ و لیباسی فەرمیی مامۆستاییەوە، مەست و ڕەنگ لێ بڕاو، لێکدا لێکدا پەرداخەکەی بەرەو پەنجەرەی شەمەندەفەرەکە درێژ دەکرد و بە پاڕانەوەوە دەیگووت: ئانیۆتا! ئانیا! ئانیا! تەنیا یەك وشە!

بووکێ، سەری لە پەنجەرەکەوە دەردێنا و بەرەو لای باوکی، خۆی دەچەماندەوە، کابرا لە حاڵێکدا کە بۆن بۆگەنی شەرابی لێ دەهات، دەیچرپاندە بن گوێی کچەکەی. ئانیا هیچی لێ حاڵی نەدەبوو چوونکە مامۆستای مەست، لەبری سرتە و چرپە، فوی دەکردە بناگوێی و لێکدا لێکدا وێنەی خاچی لەسەر ڕوخسار و سینگ و قۆڵەکانی کچەکەی دەکێشا، باوکە هەناسەی دەلەرزی و دڵۆپە فرمێسك بە چاوانییەوە دەدرەوشانەوە. دوو برا خوێندکارەکەی ئانیا – واتا پتیا و ئەندریۆشا چمکی چاکەتە فەرمییەکەی باوکییان لە دوواوە ڕادەکێشا و بە دەنگێکی تێکەڵ بە شەرمەوە دەیانچرپاندە بنگوێی:

– بەسە باوکە ... باوکە گیان بەسە وازبێنە ...

کاتێ شەمەندەفەرەکە وەجوڵە کەوت، ئانیا باوکی بینی تا ماوەیەك بە دوای فارگۆنەکەدا ڕایدەکرد، لەتری دەدا و شەراب لە پەرداخەکەی دەستیەوە دەڕژا. چ سەروشکڵێکی میهرەبان و جێگای بەزەیی هەبوو! هەست بە گوناه کردن بە سەروشکڵییەوە دیار بوو. ڕایدەکرد و هاواری دەکرد:

– هـ ... ۆ... ۆ ...

بووك و زاوا، بەتەنیا مانەوە. میدیست ئەلێکسییج چاوێکی بەنێو فاگۆنەکەدا گێڕا و کەلوپەلی گەشتەکەیانی لەسەر تاقچەکان دانا و بە زەردەخەنەوە بەرامبەر هاوسەرە گەنجەکەی دانیشت. ئەم کارمەندە دەوڵەتییە باڵای مامناوەندی بوو، کەم تا زۆرێك خڕیلە و هەڵمساو، ئاسودە و تێروپڕ، قژی لە دواوە هێشتبۆوە و ڕیش و سمێڵی دەتاشی و چەناگەی خڕ و لوس و پاك تراشاوی بە پاژنەی پێ دەچوو. بەرچاوترین تایبەتمەندی ڕوخساری، نەبوونی سمێڵ بوو و شوێنی بێ مووی ئەوێی وردە وردە بە گۆنا گۆشتن و شلەکانییەوە دەنوسا.

جوڵە و بزاوتی ئارام و ڕەفتاری لەبار بوو.

زاوا، ڕووی کردە بووکێ و گووتی:

- دەزانی ئێستا ڕووداوێکم بیرکەوتەوە کە لە ژیانمدا لە یادم ناچێتەوە. نزیکەی پێنج ساڵ لەمەوبەر ئەوکاتەی کە (کاسۆرۆتۆڤ) شانازی وەرگرتنی مەدالیای پلە دوی ( ئاننای پیرۆز ) ی پێ بڕا، بۆ دەربڕینی سوپاس و پێزانین هاتە خزمەت جەنابی پایەبەرز، بەڕێزیان فەرموی: ((ئێستا بەم شێوەیە تۆ بوویتە خاوەن سێ ئاننا : یەکێکیان بە یەخە و دوانیشیان بە گەردەنتەوە)). ئەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەو دەمە ئاننا واتا ئەو ژنە بیانوگر و ناچیزەی کاسۆرۆتۆڤ ماوەیەك بوو تۆرابوو و تازە چەند ڕۆژێك بوو گەڕابۆوە لای کاسۆرۆتۆڤی مێردی. هیوادارم ئەگەر هاتو منیش ڕۆژێك خوا کردی و مەدالیای پلە دوویان دامێ، جەنابی پایەبەرز هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەبێ بۆ گوتنی ئەم چەشنە قسانە.

زەردە بە چاوە بچۆلەکانی زاواوە دیاربوو، بووکێش زەردەی دەهاتێ بەڵام کاتێ بیری دەکردەوە لەوەی کە لەوانەیە ئێستا نا ئێستا زاوا لە ئامێزی گرێ و بە لێوە گۆشتن و تەڕەکانی ماچی بکا و ئەویش هیچ مافی ئەوەی نییە بەرگری بکات، بەسەختی خستبوویە دڵەڕاوکێوە.



ئەو، لە جوڵەی نەرمی جستەی هەڵمساوی زاوا دەترسا و هەم حەزی پێ نەدەکرد. میدیست ئەلیکسییج، هەستایە پێ، ئەو میدالیایەی بە گەردەنییەوە بوو، هەڵی دایە لایەك و چاکەت و جلوبەرگە فەرمییەکانی دانا و ڕۆبەکەی کردەبەر. پاشان لە تەنیشت ئانیاوە دانیشت و گووتی:

- ئیدی ئاوا.

ئانیا، بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ مەراسیمە ئازاردەرەکەی مارەکردنی خۆی بیرهاتەوە. پێیی وابوو کە لە کەشیشەوە بگرە تا میوانەکان و هەموو ئەوانەی کە لە کلیسا دا بوون، بەچاوی بەزەییەوە لێی دەڕوانن و دەتگووت لە خۆیان دەپرسن: ((بۆچی دەبێ خاتونێك بەو هەموو جوانیی و نازدارییەوە لەگەڵ پیاوێکی ئاوا نالەبار و بەتەمەن دا زەماوەند بکات؟)). بەیانییەکەی لەبەر ئەوەی هەموو کاروبارەکان بەجوانی ئەنجام درابوون، هەستی بە خۆشحاڵی دەکرد بەڵام دواتر لەکاتی مارەکردن و ئێستاش کە لە نێو فارگۆنی شەمەندەفەردا دانیشتبوو، خۆی بە گوناهکار و فریوخواردو و کەساس دەزانی. ڕاستە زەماوەندی لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەند و خاوەن ساماندا کردبوو بەڵام هێشتا خاوەنی قڕانێك نەبوو. لیباسەکانی بووکێنییان بە قیست بۆ کڕیبوو و ئەمڕۆش ئەو کاتەی کە باوك و براکانی بەڕێیان دەکرد سەروشکڵیان هاواری دەکرد کە ئەوانیش قڕانێکیان دە گیرفانێ دا نییە. دەبێ ئەمڕۆ شتێکیان وەگیر کەوێ بیخۆن؟ ئەدی سبەی؟ ڕوون نەبوو بە چ هۆیەکەوە بە خەیاڵی دا هات کە لەوانەیە ئێستا، باب و براکانی - کە ئەو لەلایان نییە - بە زگی برسییەوە دانەنیشتون و چەشنی یەکەم شەوی دوای بە خاك سپاردنی دایکیان، بە تازیەباریی دانەنیشتون؟ کەوتە بیرکردنەوە: ((ئای کە چەندە بەدبەختم! ئاخر بۆچی دەبێ ئەوەندە بەدبەخت بم؟)).

میدیست ئەلیکسییج، وەك ئەو پیاوە زرینگ و ژیرانەی کە نازانن بە چ شێوازێك ڕەفتار لەگەڵ ژنان دا بکەن، دەستێکی بە پشت و کەمەری ئانیادا هێنا. بەڵام لەو ساتەدا ژنەی گەنج جگە لە پارەوپول و دایکی و مەرگ و مردن، بیری لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە.  باوکی ئاننا کە مامۆستای وێنە بوو، دوای مەرگی هاوسەرەکەی دارونەداری خۆی بە هەدەر دا و هاتبووە سەر ساجی عەلی. کوڕەکانی نە باڵتۆیان هەبوو، نە پێڵاو، خۆیشی بەردەوام لە دادگاوە ڕاسپاردەی ئامادەبوونی بۆ دەهات، نێوە نێوە سەروکەللەی کارمەندانی بەشی جێبەجێکردنی دادگا دەردەکەوتن و کەلوپەلی نێو ماڵەکەیان دەنوسی و دەیانقەبلاند ... چ شورەییەك! دەبووایا ئانیا چاودێری باوکە مەستەکەی بکات، گۆرەوی دڕاوی براکانی پینە بکات، پێداویستیەکانی ڕۆژانەیان بکڕێ و هەرجارێکیش کە ستایشی جوانی و گەنجی و ڕەفتاری جوانیان دەکرد وای دەزانی تەواوی خەڵکی دونیا لە کلاوە هەرزانبەها و دڕاویی پیلاوەکانی دەڕوانن نەك لە خۆی - کە پێلاوەکانی لەجیاتی بۆیاخ بە مەرەکەب ڕەش دەکردنەوە تا لەبەرچاوی خەڵك ونیان بکات.  شەوانە فرمێسکی دەڕشتن و نەیدەتوانی غایلەی ئەوە لە مێشکی خۆی بەرێتە دەرێ کە لەوانەیە لە ئایندەیەکی نزیکدا بەهۆی لاوازی جەستەییەوە باوکی لە سەر پیشەی مامۆستایەتی لابەرن و خەم و خەفەتی بێکاریی دیقی پێ بکا و بیکوژێ.  سەرەنجام ژنە ئاشناکانی قۆڵیان لێ هەڵماڵی و کەوتنە سەر ئەوەی مێردێکی باشی بۆ بدۆزنەوە و پاش ماوەیەکی کەمیش ئەم میدیست ئەلێکسییجەیان - کە نە گەنج بوو نە قۆز، بەڵام لە بەرامبەردا خاوەن سەروەت و سامانێکی زۆر بوو - بۆ دۆزیەوە.

میدیست ئەلیکسییج، کەسێکە نزیکەی سەد هەزار ڕۆبڵی دانراوی هەیە لە بانك و خاوەنی موڵکێکیشە کە لە باوکیەوە بۆی ماوەتەوە و بە ئیجاری داوە، زۆر زۆر پابەندی دابوونەریتە و کارمەندێکی جێگای سەرنجی جەنابی پایەبەرزە



و زۆری لێ ڕازیە.  بە ئانیایان گووتبوو ئەگەر دەتەوێ باوکت لە خوێندنگە دەرنەکەن ئەوا میدیست ئەلێکسییج زۆر بە ئاسانی دەتوانێ نامەیەکت لە جەنابی پایەبەرزەوە بۆ بەڕێوەبەری خوێندنگە یان تەنانەت بۆ بەڕێوەبەرێتی پەروەردە، بۆ وەرگرێ و وابکا لەسەر کارەکەی لاینەبەن ...

لەو کاتانەدا کە ئانیا ئەم وردەکاریانەی لە مێشکی خۆی دا زیندوو دەکردنەوە، لەناکاو نەوای موزیك و دەنگی هاتوهاواری خەڵك خۆی بە ژووری فارگۆنەکەدا کرد: شەمەندەفەرەکەیان لە وێستگەیەکی بچووك ڕاوەستابوو. لەوسەر سەکۆی وێستگەکە، دوو پیاو بە گەرمی سەرگەرمی ژەنینی گارمۆن و کەمانچەیەکی زیقنی هەرزانبەها بوون، لە پشت سپیدار و سنەوبەرەکان و ڤێلایەلی غەرقی نێو تریفەی مانگەشەویشەوە ئاوازی موزیك و ئۆرکسترای سەربازیی دەهاتە بەرگوێیان.  دیاربوو هاوینەوارنشینەکان کۆڕی سەمایان سازکردبوو. هاوینەوارنشینەکان و ئەو خەڵکانەی تر کە لە ڕۆژێکی خۆش و جواندا بەنیازی هەڵمژینی هەوایەکی پاك هاتبوونە ئێرە، لەسەر سەکۆکە سەرگەرمی پیاسە کردن بوون.

(ئارتینۆڤ ) ی خاوەنی ئەم ناوچە هاوینەواریەشیان لەنێودا بوو.

ئارتینۆڤ، پیاوێکی دەوڵەمەند و بالاَبەرز، کەمێك قەڵەو، گەنمڕەنگ و شێوە ئەرمەنی، خاوەنی چاوەلێکی زەق و دەرپەڕیو، چاکەت و پانتۆلێکی سەیروسەمەرە و کراسێکی بە چەندین قۆچپەی دانەخراوەوە لەبەردا و چەکمەیەکی مامزەداری لە پێدا بوو، باڵتۆیەکی ڕەشیشی بە شانی دادابوو کە چەشنی داوێنی کەوای ژنان، زەوی لە دوای خۆیەوە گەسك دەدا. دوو سەگی ڕاوێ بە لمۆزی شۆڕەوە، هەنگاو بە هەنگاو بەدوایەوە بوون.

گەرچی هێشتا دلۆپە فرمێسك بە چاوانی ئانیاوە دەدرەوشانەوە، بەڵام ئیدی ئێستا مەرگی دایکی و دەردی بێ پارەیی و خەمی زەماوەندکردنی خۆی لەبیر

چووبۆوە. دەستی خوێندکارەلی زانکۆ و ئەفسەرانی ئاشنای دەگوشی و تەوقەی لەگەڵدا دەکردن، بە شادیەوە پێدەکەنی و خێرا خێرا دەیگوت:

- ( سلاّو، تەندروستیتان چۆنە؟).

هات لە بەردەم پلیکانەی شەمەندەفەرەکەدا و لە ژێر تریفەی مانگدا ڕاوەستا تا کلاّوە نوێ و جلوبەرگە بەشکۆیەکەی نمایش بکات و بیخاتە بەرچاوی ئامادەبووان. ئەمجار ڕوی کردە یەکێك لە پیاوە ئاشناکان و پرسی:

- ئەوە بۆچی شەمەندەفەکە وەڕێ ناکەوێ؟

- ئێرە دوریانە، چاوەڕوانی تێپەڕینی شەمەندەفەری پۆستەن.

ئانیا هەرکە بینی ئارتینۆڤ سەرنجی دەداتێ، بە ناز و کریشمەوە چاوەکانی بچووك کردنەوە و لەبری ڕوسیی دەستی کرد بە قسەکردن بە زمانی فەرەنسیی. بە هۆی چەند هۆکارێکەوە، کە هەندێکیان بریتی بوون لە: ئاوازی دەنگی پڕسۆزی و دەنگی ئەو موزیکەی کە دەبیسترا و ڕەنگدانەوەی تریفەی مانگ بەسەر حەوزە ئاوەکە و ئارتینۆڤ - ئەو دۆن جوانە بەنێوبانگ و مێبازە - کە لێی دەڕوانی و دواهەمینیشیان بەهۆی ئەوەی کە هەموان شاد و خۆشحاڵ بوون، ئەویش هەستی بە شادیەکی زۆر کرد.  هەرکە دوبارە شەمەندەفەرەکە وەڕێ کەوتەوە ئەفسەرە ئاشناکان بۆ نیشاندانی ڕێزی خۆیان سلاّوی سەربازییان بۆ کرد. لەبەرخۆیەوە دەستی کرد بە گوتنی گۆرانییەکی ( پولکایی *) - هەمان ئەو گۆرانییەی کە دەنگی لە پشت درەخت و ڤێللاکانەوە دوابەدوای شەمەندەفەرەکە دەهات و ئەوی بەڕێ دەکرد.

ئەمجار بە هەستێکی وەك ئەوەی کە لەو وێستگە بچووکەدا سەرەڕای هەمو گرفت و نەهامەتیە پێشبینی کراوەکانی ئاینده، لە خۆشبەخت بوونی خۆی دڵنیا کرابێتەوە، گەڕایەوە نێو فارگۆنەکە.



بووك و زاوا، ماوەی دو ڕۆژ لە پەرستگا مانەوە، دواتر گەڕانەوە شار. لە ئاپارتمانێکی دەوڵەتیی دا نیشتەجێ بوون. کاتێ میدیست ئەلێکسییج دەچووە فەرمانگە، ئانیا لە ماڵەوەدا خۆی بە لێدانی پیانۆوە سەرگەرم دەکرد، یان دڵی توند دەبوو و دەگریا  یان لە سەر کاناپەیەك ڕادەکشا و ڕۆمانی دەخوێندەوە و دەکەوتە سەیرکردنی گۆڤارەلی مۆد.  میدیست ئەلێکسییج، لە سەر مێزی نانخواردن تا زگی هەڵی دەگرت دەیخوارد و لە بارەی سیاسەت و دامەزران و گواستنەوە و بەرزکردنەوەی پلەوپایەوە دەکەوتە قسەکردن و دەیگوت دەبێ مرۆڤ لە هەموو حاڵەتەکاندا زەحمەت بکێشێ، ژیانی ژن و مێردایەتی تەنیا بریتی نییە لە حەز و چێژ بەڵکو ئەرکە، دەبێ مرۆڤ دەسپێوەگر بێت و هەپڵەخەرجیی نەکا و نرخی پارە بزانێ، لە ڕوانگەی ویەوە باوەڕ و ئایندارییی لەسەروی هەموو شتێکەوەیە. بەدەم ئەو قسانەوە چەقۆکەی چەشنی شمشێر لە دەستیدا دەگوشی و دەیگوت: دەبێ هەموو مرۆڤێك ئەرك و لێپرسراوێتیەکی هەبێ.

ئانیا گوێی دەدایە قسەکانی و لێی دەترسا، پاروی بە قوڕگیدا نەدەچووە خوارێ و زۆربەی جاران بە زگی برسییەوە لە سەر مێزەکە هەڵدەستا. میدیست ئەلێکسییج، ڕاهاتبوو دوای نیوەڕۆیان سەرخەوێك بشکێنێ و هەرکە دەنگی پرخوهۆڕیی بەرز دەبۆوە ئانیاش هەڵدەستا دەچووە لای براکانی. ئەوان بە نیگا تایبەتیەکانی خۆیانەوە بە جۆریك لێیان دەڕوانی وەك ئەوەی هێندە نەبێ لەبەر خاتری ماڵی دنیا لەگەڵ ئەو پیاوە ناقۆڵایەدا زەماوەندی کردبێ و لۆمە و سەرزەنشت لە نیگایان دەباری. خشەخشی کراسەکەی و زرینگە زرینگی بازنەکانی و بەشێوەیەکی گشتی سەروشکڵی ژنانەی، بێزار و دڵتەنگی دەکردن. کەم تا زۆر شەرم دایدەگرتن و نەیاندەزانی لەلای ئەوەوە لە بارەی چیەوە قسان بکەن.  لەگەڵ ئەوەشدا چەشنی ڕۆژانی پێشوو خۆشیان دەویست و هێشتا ڕانەهاتبوون بەبێ وی نانی نیوەڕۆ بخۆن.  ئانیاش لەگەڵیاندا لە سەر مێزێك

دادەنیشت و دەکەوتنە خواردنی ئاشکەلەم و قبوولێی و پەتاتەیەك کە بە دونگی مەڕ سورکرابۆوە و بۆنی مۆمی لێ دەهات. پیوتەر لیۆنتیج دۆلکە ڤۆدکاکەی بەدەستە لەرزۆکەکانی هەڵدەگرت، پەرداخەکەی خۆی پڕ دەکرد و بەپەلە و تامەزرۆییەوە سەری پێوە دەنا، دیسان پەرداخێکی تر و پەرداخێکی تر ... پتیا و ئەندریۆشاش - ئەو تازەلاوە لەڕولاواز و ڕەنگ پەڕیو و چاوگەورانە - دۆلکەکەیان لەسەر مێزەکە هەڵدەگرت و بە سەرسوڕمانەوە دەیانگوت:

- هیچی تر مەخۆوە بابە گیان ... بەسە بابە گیان.

ئانیاش نیگەرانی و دڵەڕاوکێ دایدەگرت و لێی دەپاڕایەوە کە هیچی تر نەخواتەوە، بەڵام پیوتەر لیۆنتیج ئاگری دەگرت و توڕە دەبوو و مستی دەکێشا بە مێزەکەدا و هاواری دەکرد:

- مۆڵەت بە کەس نادەم ڕێگام پێ بگرێ و ئامۆژگاریم بکات! هەمووتان لێرە وەدەردەنێم!

بەڵام دەنگی ئارام و میهرەبانی، بچووکترین تەزوی ترسی بە دڵی منداڵەکانیدا نەدەهێنا. دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ، دەچووە بەردەم ئاوێنەکە، گەردەنی درێژ دەکرد و لەخۆی دەڕوانی و قژی شانە دەکرد و دەستی بە سمێڵی دا دێنا و گولاوی لە خۆی دەدا، بۆیمباخی دەبەست، دواتر دەسکێشەکانی لە دەست دەکرد و کڵاوە ڕەنگاوڕەنگەکەی دەکردە سەر و بە مەبەستی وتنەوەی وانەی تایبەتی، لە ماڵ دەچووە دەرێ. بەڵام ئەو کاتانەی کە پشوی فەرمی و پشوی هەفتە بوو لەماڵ نەدەچووە دەرێ و دەکەوتە وێنەکێشان یان خۆی بە ژەنینی ئۆرگەوە - ئۆرگێك کە هەر بۆڕە بۆڕ و هاشەهاشی لێ دەهات - سەرگەرم دەکرد. هەوڵی دەدا بەو ئامێرە دەنگەلی هاوئاهەنگ و گونجاوی پێ دەربکا و لەبەرخۆشیەوە لەگەڵیدا دەیگوتەوە یان بەسەر منداڵەکاندا دەیقیژاند:

- هەی چەپەڵینە! ناکەسینە! ئەم ئامێرەتان بۆ وا خراپ کردووە!



میدیست ئەلیکسییج، شەوانە لەگەڵ هاوکارەکانی فەرمانگەکەی دا، کە ئەوانیش لە هەمان ئاپارتمان دەژییان، دەکەوتە یاری کاغەز. ژنەکانیشیان - کە هەموو ناشیرن و نالەبار و ناشیرنپۆش و لیر و لە کارەکەران دەچوون - هەرهەمویان دەهاتن و لە دەوری یەکتر کۆدەبوونەوە و دەکەوتنە قسە کردن لەبارەی شتی لە خۆیان ناشیرنتر و بێ تامتر. هەندێك جار وا ڕێدەکەوت کە میدیست ئەلیکسییج ئانیاش لەگەڵ خۆیدا بەرێتە شانۆ. لە پشوی نێوان پەردەکاندا ساتێك چیە لێی جیا نەدەبۆوە، قۆڵی لە قۆڵی هەڵدەکێشا و لە ڕاڕەو و شوێنی چاوەڕوانییی دا دەکەوتە پیاسە کردن. هەرکاتێ بە تەنیشت ئاشنایەکدا تێپەڕیبا، دوای سلاو و هەواڵپرسیی، سەرێکی دادەنەواند و بێ دواکەوتن دەیچرپاندە بن گوێی ئانیادا:

- ((کارمەندێکی پلەبەرزە ... جەنابی پایەبەرز زۆری خۆشدەوێ)) یان ((دەوڵەمەندە ... خاوەن خانوی تایبەتیی خۆیەتی)). هەرکاتێ بە بەردەم بووفەکەدا تێدەپەڕین، ئانیا حەزی دەکرد شتێك بخوات - زۆر حەزی لە شکۆلاتە و کێکی سێو بوو - بەڵام لەلایەك گیرفانی قرانێکی تێدا نەبوو و لە لایەکی تریشەوە شەرمی دەکرد داوای پارە لە میدیست ئەلیکسییج بکات. میدیست ئەلیکسییجش دەچووە بەردەم بووفەکە و هەرمێیەکی هەڵدەگرت و بە پەنجەکانی تا ڕادەی فلیقاندنەوە دەیگوشی و دواتر پیاوانە دەیپرسی:

- هەرمێ دانەی بە چەندە؟

- بیستوپێنج کۆبیك.

- سەیرە!

هەرمێیەکەی لە شوێنی خۆی دادەنایەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی بە کەمی سەرشانی خۆی دەزانی بەبێ کڕینی شتێك بووفەکە جێ بێڵێ، بتڵێك ئاوی کانزایی گازداری دەکڕی و یەکبین بەسەریەوە دەنا و چۆڕپڕی دەکرد، بەشێوەیەك کە ئاو

دەزایە هەردوو چاویەوە. لەو ساتانەدا ئانیا زۆری ڕق لێ دەبۆوە و لێی بێزار بوو. هەندێك جاریش بە ڕوخساری سورهەڵگەڕاو و دەنگێکی تێکەڵ بە شپرزەییەوە ڕووی دەکردە ئانیا و دەیگووت:

- سەر دانەوێنە بۆ ئەو پیرەژنەی کە خەریکە بەرەو ئێرە دێت!

- ئێ خۆ من نایناسم!

هیچ جیاوازی نییە! ژنی بەرپرسی فەرمانگەی داراییە! پێت دەڵێم سەری بۆ دانەوێنە!

بە بۆڵەوە لێی زیاد دەکرد:

- خۆ بەو سەردانەواندنە سەرت لە لاشەت جیا نابێتەوە!

ئانیاش بە ناچاریی بە جوڵەی سەر ڕێزی خۆی دەردەبڕی. گەرچی سەری لە لاشەی جیا نەدەبۆوە بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خەفەتی پێوە دەخوارد.

ئانیا، ئەو وردە فەرمان و ڕاسپاردانەی مێردەکەی بەتەواویی جێبەجێ دەکرد و دڵگیر دەبوو لەوەی کە چەشنی کچۆڵەیەك فریویان دابوو. ئانیا، کە تەنیا لەبەر ماڵی دونیا و سامان شوی بەم پیاوە کردبوو، ئێستا گیرفانی لەسەردەمی کچێنیی زۆر بەتاڵتر بوو. تا شوی نەکردبوو، هیچ نەبا هەندێك جار باوکی یەك دو دانە بیست کۆبیکی دەخستە دەستیەوە، بەلاّم ئێستا خاوەنی یەك کۆبیکیش نەبوو! نەیدەتوانی بە دزییەوە پارەی مێردەکەی ببا یان داوای پارەی لێ بکا، وای هەست دەکرد کە ئەو ترسەی لەو پیاوە هەیەتی، هی چەندین ساڵ پێشترە و لەچەندین ساڵ لەوە پێشەوە هێلانەی لە ناخیدا کردووە. سەردەمانێك بەڕێوەبەری خوێندنگەی بە ترسناکترین و زۆردارترین هێزێك دەزانی کە لەوانەبوو هەر ساتێك بێت چەشنی هەورەتریشقەیەك یان شەمەندەفەرێکی بەهاشە و ناڵە بەرەو ڕووی بێت و لەژێر خۆیدا بیپلیشێنێتەوە و پارچە پارچەی بکات. هێزێکی تر کە لەماڵەوە هەمیشە قسەیان لەبارەوە دەکرد و ڕوون نەبوو



بە چ هۆیەکەوە لێی دەترسێن جەنابی پایەبەرز بوو. ئانیا نزیکەی دە دانە هێزی بچووکی تری چەشنی مامۆستا بێ بەزەییەکانی خوێندنگەی بە گۆنا لوس و تاشراوەکانیانەوە هێنایەوە یادی خۆی. ئێستا هێزێکی تریشی بە نێوی میدیست ئەلیکسییج - پیاوێکی پابەند بە دابوونەریت و یاسا کە تەنانەت سەروشکڵیشی لە بەڕێوەبەری خوێندنگە دەچووو - لێ زیاد ببوو. هەموو ئەم هێزانە لە خەیاڵی ئانیادا تێکەڵ دەبوون و شکڵ و شێوەی ورچێکی سپی زەبەلاحیان بەخۆوە دەگرت و شالاّویان بۆ مرۆڤە لاواز و گوناهکارەکانی چەشنی باوکی، دێنا. هەرکاتێ میدیست ئەلیکسییج نەوازشی دەکرد و دواتر بە شێوەیەکی ڕقبزوێن لە باوەشی خۆیدا دەیگوشی، دەترسا نارەزایەتی نیشان بدا و پاشان بە ناچاری زەردەخەنەی دێنا سەر لێوان و خۆی بە خۆشحاڵ نیشان دەدا.

پیوتەر لیۆنتیج، تەنیا یەك جار زاتی ئەوەی کردبوو بۆ دانەوەی یەکێك لە قەرزە ئازاردەرەکانی بڕی پەنجا ڕۆبڵ لە میدیست ئەلیکسییجی زاوای قەرز بکات. ئەویش بە چ شەرمەزاریی و خۆ بە سوك زانین و نائاسودەییەکەوە! میدیست ئەلیکسییج دوای ساتێك بێدەنگی پێیگوتبوو:

- زۆر باشە، پەنجا ڕۆبڵت دەدەمێ بەلاّم تا کاتێ وازت لە مەی خواردنەوە نەهێنابێ ئەمە دواجار دەبێ هاوکاریت بکەم و پارەی ترت بدەمێ. ئەم جۆرە ڕەفتار و کردەوانە بۆ کارمەندانی دەوڵەت شیاو نین، جێگای شەرمن. بۆیە لێرەدا بە پێویستی دەزانم ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرت وەبیر بێنمەوە: گیرۆدە بوون بە مادە کحولییەکان زۆرێك لە پیاوە بەتوانا و لێهاتوەکانی لەبن هێناوە کە ئەگەر توانیبایان خۆی لێ دوورخەنەوە، ئەوا وردە وردە پلەوپێگەیەکی بالاّتریان وەدەست دێنا.

وەدواتر سەرەداوی زۆربلێیی و هەڵەوەڕییەکانی دەگەیاندە سەر ئەم چەشنە قسانە کە زۆری بەکار دێنان: (( لەبەر ئەوەی کە ... )) یان (( بە سەرنجدان لەو بابەتەی کە باسمکرد )) یان (( بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە لەبارەیەوە دوام )) و ڕستەگەلی لەم بابەتە.  ئیدی پیوتەر لیۆتیجی داماو لەم هەموو سوکایەتیی و سەرکۆنەکردنانە دڵی پڕ دەبوو و زۆری خەفەت دەخوارد، ئارەزوی هیچ شتێکی نەدەکرد جگە لەوەی دیسانەوە پەنا بۆ مەی بەرێتەوە.

پتیا و ئەندریۆشاش کاتێ بۆ سەردان بە پێڵاوی دڕاو و پانتۆڵی نیمچە داڕزیوەوە دەهاتنە لای ئانیای خوشکیان، ناچاربوون گوێ بۆ پەند و ئامۆژگاریەکانی میدیست ئەلیکسییجی زاوایان بگرن.

میدیست ئەلیکسییج، قسەی بۆ دەکردن و دەیگووت:

- هەموو مرۆڤێك دەبێ خاوەنی ئەرك و لێپرسراوێتی بێت!

بەلاّم لەگەڵ ئەوەی ئەو هەموو پەند و ئامۆژگاریەی دەیکردن هەرگیز بەخشندەیی نەنواند، ئەڵبەتە دیاری لە چەشنی ئەنگوستیلە و بازنە و سنجاقی سینە و شتی لەو بابەتەی بۆ ئانیا دەکڕی بەلاّم لە هەمان کاتیشدا دەیدا بە گوێیدا کە ئەم شتانە ڕۆژێك دێ بەکاری مرۆڤ بێن. زۆر جاران بۆفییەکەی ئانیای دەپشکنی تا دڵنیا بێت لەوەی کە ئاخۆ  کەلوپەلەکانی ماون و هیچیان لێ ون نەبوون!

2

زستان گەیشت، هێشتا چووار مانگی مابوو بۆ جەژنی کریسمس ڕاگەیەنراوێك لە ڕۆژنامەیەکی ناوچەکەدا بلاّو کرابۆوە و تیایدا هاتبوو کە لە ڕێکەوتی 28 ی دیسەمبەر لە تەلاری ئەنجومەنی ڕەسەنزادان بە ڕەواڵی سالاّنی پێشوو کۆڕی سەمای زستانە ساز دەکرێ.



لەو ڕۆژە  بەدواوە، هەرکە یاری شەوانەیان کۆتایی پێ دەهات، میدیست ئەلێکسییج بە حاڵەتێکی تێکەڵ بە دوودڵیی و خرۆشانەوە لە گەڵ ژنی هاوکارەکانیدا دەکەوتە چپەچپ و بە نیگەرانییەوە دەیڕوانییە ئانیا و بە بەدەم بیرکردنەوەوە لە گۆشەیەکەوە بۆ گۆشەیەکی تری ژورەکە دەکەوتە هاتوچۆ کردن.

سەرەنجام شەوێکیان لەبەردەم ئانیادا ڕاوەستا و گووتی:

- دەبێ جلوبەرگی پێویست بۆ ئەو شەوە بکڕیت، تێدەگەی؟  بەلاّم تکام وایە لەو بارەیەوە ڕاوێژێك لەگەڵ (ماریا گریگۆرێڤنا ) و (ناتالیا کۆزمینیشنا ) دا بکە.

ئەمەی گوت و سەد ڕۆبڵی دایە ئانیا. ژنە پارەکەی وەرگرت بەلاّم بۆ جلوبەرگ کڕین ڕاوێژی لەگەڵ کەس دا نەکرد.  تەنیا باوکی نەبێ کە لێی پرسی ئەگەر هاتبا و ئێستا دایکی مابا بۆ شەواهەنگێکی لەم چەشنە چ جلوبەرگێکی لەبەر دەکرد. دایکی خوالێخۆشبووی ژنێکی جوانپۆش بوو و بەردەوام جلوبەرگی جوان و سەرنجڕاکێشی بۆ ئانیاش دەکڕی. کچەکەی، واتا ئانیای فێری زمانی فەڕەنسی و سەمای (مازۆرکا *) کردبوو. ( خۆیشی بەرلەوەی لەگەڵ پیوتەر لیۆنتیجی باوکی ئانیادا زەماوەند بکات نزیکەی پێنج ساڵ کاری لە ماڵی یەکێك لە ڕەسەنزادەکاندا کردبوو ). ئانیا زۆر شتی لە دایکییەوە بە میرات بۆ مابۆوە، لەوانە: دەیزانی بە کەمێك دەسکاری جلوبەرگە کۆنەکان نوێ کاتەوە، پەڵەی سەر دەستەوانەکانی بە بەنزین لێ کاتەوە، خشڵ و کەرەستەکانی خۆڕازاندنەوە بەکرێ وەرگرێ، چاوەکانی وەك دایکی بچووك بکاتەوە، لە قولاّیی ژێیەکانی قوڕگیەوە قسان بکا، ڕەوت و ڕواڵەتی لەبەردلاّن بەخۆوە بگرێ و لە حاڵەتی پێویستدا خۆی شاد و شاگەشکە، یان خەمبار و کارەستبار نیشان بدا. بەلاّم موی قژ و چاوانی ڕەش و خولقوخۆی گەرم و بایەخ بەخۆدانی، لە بابییەوە بۆ مابۆوە.

نیو دەمژمێر بەر لە چوونیان بۆ کۆڕی سەما، ئەو کاتەی کە میدیست ئەلیکسییچ بەبێ چاکەت و بە مەبەستی بەخۆوە خستنی میدالیاکەی لەبەر ئاوێنە بالاّنماکە، خۆی بە ژورەکەی ئەودا کرد، لەجوانی ئانیا و جلوبەرگە بەشکۆکەی حەپسا و بە شانازیەوە دەستێکی بە پشتەسەری خۆی دا هێنا و گووتی:

- ئەی خوایە چ ژنێکی نازدارم هەیە! ... ئانیوّتا! چەندە نازداری!

دواتر تۆنی دەنگی گەڕایەوە سەر دۆخی پێشو و هەمیشەیی خۆی و درێژەی پێ دا:

- من تۆم لە ژیاندا خۆشبەخت کردووە و ئەمڕۆش نۆرەی تۆیە من خۆشبەخت بکەی. دەبێ ئەمڕۆ لەگەڵ هاوسەرەکەی جەنابی پایەبەرزدا بناغەی ئاشنایەتیی داڕێژی! تکات لێ دەکەم بەقسەم بکە! لە ڕێگەی ئەوەوە دەتوانم پلەکەم بەرز بکەمەوە.

بەرەو کۆڕی سەما وەڕێکەوتن. گەیشتنە تەلاری ئەنجومەنی ڕەسەنزادانی شار، خزمەتکاران لەبەر دەرگا بە دو ڕیز ڕاوەستابوون. چوونە هاڵێکی گەورە و بەرینەوە کە پڕ بوو لە فاقی جل هەڵواسین و باڵتۆی چەرمیین، خزمەتکارەکان بەپەلە بەیەکدا دەهاتن و دەچوون. خانمانی عەزییەلەبەر، هەوڵیان دەدا بە باوەشێنەکانی دەستیان، خۆیان فێنك بکەنەوە. بۆنی گازی چرا و سەربازەکان، هاڵەکەی تەنیبۆوە. ئەوکاتەی کە ئانیا قۆڵی لە قۆڵی مێردەکەی هەڵکێشابوو و خەریکبوون بە پلیکانەکان دا سەردەکەوتن، گوێی لە دەنگی موزیك بوو و خۆی لە ئاوێنەیەکی بالاّنما دا بینی کە لەبەر تیشکی ئەو هەمو چرایەدا سەرتاپا دەدرەوشایەوە. شادیەکی لە گێڕانەوە نەهاتوو، سەرتاپای جەستەی گرتەوە و هەمان هەستی خۆشبەختبوون - چەشنی یەکەم شەوی بووکێنیی بەر تریفەی مانگەشەوی وێستگە بچووکە - سەرتاپای جەستەی گرتەوە. بە



لەخۆڕازیبوون و هەستێکی پڕ لە متمانە بەخۆبوونەوە هەنگاوی دەنان و خۆی بە خانمێکی گەنج دەزانی و بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ هەوڵیدەدا لاسایی ڕەوت و ڕەفتاری دایکی خوالێخۆشبووی بکاتەوە. یەکەمین جار بوو کە خۆی بە کەسێکی ئازاد و دەوڵەمەند دەزانی. تەنانەت بوونی میدیست ئەلیکسییچیش نیگەرانی نەدەکرد چوونکە بەشێوەیەکی غەریزەیی دەیزانی کە بوونی مێردێکی پیر لەگەڵیدا زۆر باشترە لەوەی بە تەنیا بێت بۆ تەلاری ئەنجومەن و دەشیزانی ئەمە نەك نابێتە هۆکاری بەکەم دەرکەوتن و بچووکیی وی بەڵکو دەبێتە مایەی هەرچی زیاتر دەرکەوتن و درەوشانەوەی.

ئۆرکسترا لە هاڵە سەرەکییەکەدا دەینالاّند. سەما دەستی پێ کردبوو. ئانیا کەوتەوە یادی ئاپارتمانە دەوڵەتییەکەیان، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و لە ژێر کاریگەری موزیك و هاتوهاوار و ئەو هەموو ڕوناکییەدا، بەخۆی گووت: (( ئاه، چەندە جوان و سەرنجڕاکێشە!)) و لە هەمان کاتیشدا هەموو ئەو ڕوخسارە ئاشنایانەی کە پێشتر لە بانگێشت و میوانداری و گەشتەکاندا دیتبوونی، هەموو ئەو ئەفسەر و مامۆستا و بریکار و کارمەند و خاوەن موڵك و جەنابی پایەبەرز و ئارتینۆڤ و ژنانی جوانپۆش و عەزیە لەبەر و هەموو جوان و ناشیرنەکانی ئەو چینەی کۆمەڵگای - کە ئێستا هاتبوون لە نێو شوێن و جێگاکانی ئەم ( بازاڕی ئەنجومەنی خێرخوازیی ) یەدا و لە پێناو بەرژەوەندیی خەڵکانی هەژار و بێنەوا دا شت بفرۆشن - ناسیەوە.

ئەفسەرێکی بالاّبەرز و بەهەیکەل بە بروسکەی ڕوتبەکانی سەرشانییەوە، کە ئەو کاتەی ئانیا لە خوێندنگەی ئامادەیی دەیخوێند و لە شەقامی ستارۆکیێڤسکایا دا ببووە ئاشنای و ئێستا کتوپڕ نێوەکەی لەبیر چووبۆوە، لە بەرامبەریدا قووت ببۆوە و بانگێشتی کرد بۆ تاوێك سەمای ڤالس. ژنەی گەنج ڕەزامەندی نواند و یەکسەر بە تەنیشت مێردەکەیدا باڵی گرت و ڕۆیشت. ئێستا وای

هەست دەکرد بە بەلەمێکی چارۆکەدارەوە لە دەریایەکی بێ سنور دایە و  با پاڵی پێوە دەنێ و مێردەکەشی لەشوێنێکی دورەدەست و لە کەنار دەریادا ماوەتەوە ... بە گەرمیی و حەز و شۆڕوشەوقێکی زۆرەوە، بە هەرسێ شێوازی ڤاڵس و پوڵکا و کادری، سەمای دەکرد و بەردەوام لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر بانگێشتی سەمای تر دەکرا و دەست بە دەست دەگەڕا.  لە نەوای موزیك و هاتوهاواری ئامادەبووان، وەجۆش هاتبوو. لە توێی قسەکانیدا وشەی فەرەنسیی تێکەڵی ڕوسیی دەکرد، پیتی (ڕ) ی بە (غ) گۆ دەکرد و پێدەکەنی، نە بیری لە مێردەکەی دەکردەوە، نە لە هیچ کەس و هیچ شتێکی تر. ڕوون بوو کە ببووە جێگای سەرنجی هەمووان - وە جگە لەمە چاوەڕوانی هیچ شتێکی تر نەدەکرا - لە خۆشیان هەناسەی بۆ نەدەدرا، باوەشێنەکەی لە نێو دەستە لەرزۆکەکانیدا دەگوشی و هەستی بە تینوێتی دەکرد.  باوکی، واتا پیوتەر لیۆنتیچ - کە جلوبەرگە فەرمییەکانی بۆنی بەنزینیان لێ دەهات - لێی نزیك بۆوە و زەرفێکی پڕ لە بەستەنی میوەی بۆ ڕاداشت و وە لە حاڵێکدا کە چاوەکانی لە خۆشییان دەدرەوشانەوە، گووتی:

- ئەمشەو زۆر جوان و دڵڕفێنیت، هەرگیز هێندەی ئەورۆ لەو مێردکردنە ناوەختەت هەستم بە پەژارە و نیگەرانی نەکردبوو ... بۆچی؟ دەزانم لەبەر خاتری ئێمە نەبووایە ڕازی نەدەبوویت بەم مێردکردنە بەڵام ...

وە بە دەستە لەرزۆکەکانی بەستە پارەیەکی لە گیرفانی هێنایە دەرێ و درێژەی پێدا:

ئەمڕۆ لەبری گوتنەوەی وانەی تایبەتیی پارەم وەرگرتوە، دەتوانم قەرزی پیاوەکەت بدەمەوە.

بەڵام ئانیا دەفری بەستەنییەکەی دایەوە باوکی و قۆڵی لە قۆڵی پیاوێك - کە داوای سەمای لێ کردبوو - هەڵکێشا و لەنێو خەڵکەکەدا ون بوو، لەسەر



شانی ئەو پیاوەی کە سەمای لەگەڵدا دەکرد باوکی بینی کە لە ژنێك نزیك بۆوە، دەستی لە کەمەری گیر کرد و دەستی کرد بە سەما.

ئانیا لە دڵی خۆیدا گووتی: (( ئەو ساتانەی کە سەرخۆش نییە چەندە بەسۆز و میهرەبانە! )).

سەمای مازۆرکای لەگەڵ ئەو ئەفسەرە بالآبەرز و چووارشانەیەدا کرد.  کابرا بە قورساییەکی - چەشنی لاشەیەك لە لیباسی سەربازیدا - هەنگاوەکانی دەجولآند و سینگ و شانەکانی دەبزاوت و پاژنەکانی بە دەکوتا بە زەوی دا. بە ئاشکرا پێوەی دیار بوو کە حەزی لە سەماکردن نییە، لە حاڵێکدا کە ئانیا بە گوڕوتینێکی زۆرەوە، چەشنی باڵندەیەکی سوکباڵ هەڵدەبەزیەوە و بە ڕوخسارە جوان و گەردەنە ڕوت و درێژەکەی، کابرای شەیدا کردبوو. تروسکاییەکی جوان لە چاوەکانیدا دەدرەوشایەوە و بزاوت و جوڵەکانی شەهوەت بزوێن بوون بەڵام ئەفسەرە کەڵەگەتەکە تا دەهات شلوشۆقتر دەبوو و لە کاتی سەمادا بە شێوەی پاشایەك دەستەکانی بە مەبەستی دڵدانەوە بەرەو لای ئەو درێژ کردبوو.

هێندێك کەس کە  سەیریان دەکرد، یەکبین دەیانگووت:

- براڤۆ! ... براڤۆ! ...

کاکی ئەفسەر وردە وردە تاوی دەسەند. ئێستا ئیدی شەیدا لە ڕوخساری جوانی ئانیا، بەچووستی و چاپوکی تازەلاوێکەوە سەمای دەکرد.  بەڵام ئانیا تەنیا بە جوانی شانەکانی دەلەرزاند و بە مەکر و نازەوە لێی دەڕوانی وەك ئەوەی ئەو شاژن بێ و کابرای ئەفسەریش کۆیلەی. پێی وابوو تەواوی خەڵکی نێو تەلارەکە لێی دەڕوانن، دڵبەستەی وی بوونە و ئێرەیی پێدەبەن. هەرکە سەمای مازۆرکا کۆتایی پێهات و بەر لەوەی ئەفسەرەکە بتوانێ سوپاسی بکات، لەناکاو ئاپۆرەی خەڵکەکە درزێکی تێکەوت و کشانەوە دواوە و پیاوەکان خۆیان قیت کردەوە و دەستەکانیان بەردانەوە. جەنابی پایەبەرز بوو کە بە فراکێکی دو

ئەستێرەی بریسکەدار بەسەر شانەوە، بەرەو لای ئانیا دەهات. بەڵێ، جەنابی پایەبەرز بوو بەرەو لای ئەو دەهات، چوونکە نیگای چاوەکانی ڕێك بڕیبوونە وی و زەردەخەنەیەکی دەسکردی بە گۆشەی لێوانەوە بوو و لێوەکانی لێکدی دەسوی - هەرکاتێ ژنێکی جوان و نازداری بینیبا لێوەکانی لێکدی دەسوی. هەرکە ئانیا لێی وەنزیك کەوت، گووتی:

- زۆر خۆشحاڵم ... زۆر خۆشحاڵ ... دەبێ فەرمان بدەم مێردەکەت بخەنە زیندانەوە چوونکە گەنجینەیەکی ئاوا بەنرخی لە چاوی ئێمە شاردۆتەوە.

لە حاڵێکدا کە دەستی بەرەو لای ئانیا درێژ دەکرد درێژەی دایە:

من لە لایەن هاوسەرەکەمەوە ڕاسپێردراوم بێمە خزمەتت ... دەبێ هاوکاریمان بکەی... بەڵێ هاوکاریی! جێگای خۆیەتی ئێمەش وەك ئەمریکاییەکان شاجوانی ولاتی خۆمان هەڵبژێرین و بە دڵنیاییشەوە خەلاتی یەکەم دەدەین بە تۆ ... بەڵێ وەك ئەمریکاییەکان ... خانمەکەم بەوپەڕی بێ ئارامییەوە چاوەڕوانتە.

پاشان ئانیای بەرەو ژوورێك ڕێنمایی کرد کە خانمێکی تا ڕادەیەك بەتەمەن و گووپنی لێ دانیشتبوو کە دەتگوت بەردێکی گەورەیان خستۆتە دەمییەوە. هاوسەری جەنابی پایەبەرز بە تۆنێکی درێژکراوەوە گووتی:

- یارمەتیمان بدە. سەرجەم ژنە جوانەکان لە (بازاڕی خێرخوازیی) سەرگەرمی کارێکن، نازانم بۆچی تۆ جگە لە کەیف و سەما، هیچ کارێکی تر ناکەیت. بۆچی یارمەتیمان نادەی؟

ئەمەی گووت و چووە دەرەوە. ئانیا چووە جێگاکەی ئەو و لەبەردەم پیاڵە و سەماوەرە زیوینە وەجۆش هاتوەکە دانیشت و جێگای ئەوی گرتەوە. بێ دەرەنگ بازاڕی گەرم کرد. بۆ فنجانێك چای لە ڕۆبڵێك کەمتری وەرنەدەگرت. ئەفسەرە بالآبەرزەکەی وا لێ کرد سێ فنجان چای بخواتەوە. ئارتینۆڤ، ئەو خاوەن موڵکە دەوڵەمەندە کە بەدەست نەخۆشی هەناسە توندییەوە گیرۆدە ببوو، بە



چاوانی دەرپەڕیوەوە و وەك هەموان فراك لەبەر - نەك بەو چاکەت و پانتۆڵە سەیرەی کەهاوینی ڕابردو لەوێستگەکە لەبەری دابوو - هاتە ئەو شوێنەی کە ئانیای لێبوو، بێ ئەوەی چاو لەسەر ئانیا هەڵگرێ، پەرداخێك شەمپانیای نۆش کرد و لەحاڵێکدا کە بەڕوونی دیاربوو نائاسودەیە بەدەست هەناسە تەنگییەوە، بێ وتنی تاقە وشەیەك، سەد ڕۆبڵی دانا و دواتریش فنجانێك چای خواردەوە و سەد ڕۆبڵی تریشی دانایە سەر مێزەکە ... ئانیا پیاوەکانی بۆ لای شوێنەکەی خۆی بانگێشت دەکرد و پارەی لێ وەردەگرتن و لە هەمان کاتیشدا بەتەواوی دڵنیابوو کە بە نیگا و زەردەخەنەکانی، ڕەزامەندیی تەواوی بەم خەڵکە بەخشیوە. ئیدی ئێستا بە تەواویی بۆی دەرکەوتبوو کە ئەو تەنیا بۆ ئەم چەشنە ژیانە، واتا هەمان ژیانی پڕ لە زەرقوبەرق و هاتوهاوار و موزیك و سەما و خەڵك سەرسامکردن، دروست ببوو.

ئەو ترسوخۆفەی کە لە ڕابردودا لە هیزێکی پەلاماردەر و تێکشکێنەر هەیبوو ئێستا بەلایەوە جگە لە ترسوخۆفێکی نابەجێ و جێگای پێکەنین، هیچ شتێکی تر نەبوو. ئیدی لە هیچ کەسێك نەدەترسا تەنیا شتێك کە نیگەرانی کردبوو و خەفەتی لێ دەخوارد ئەوەبوو کە دایکی لە ژیاندا نەمابوو کە سەرکەوتنەکانی وی بەچاوی خۆی ببینێ و شادی دایگرێ.

پیوتەر لیۆنتیجی باوکی ئانیا، ڕەنگی بە ڕوخسارەوە نەمابوو بەڵام هێشتا توانای ئەوەی مابوو خۆی بەپێوە بگرێ، هاتە لای ئانیا و دوای پەرداخێك کۆنیاکی کرد. ئانیا چاوەڕوانی ئەوە بوو هەندێك قسەی نەشیاو و نابەجێ بکات (ئێستا هەستی بە شەرم دەکرد لەوەی کە باوکی، کەسێکی ئاسایی و دەسکورت بوو)، بەڵام پیوتەر لیۆنتیج کۆنیاکەکەی هەڵدا، دە ڕۆبڵییەکی لەنێو بەستە پارەکەی دەرهێنا و هەڵیدایە سەر مێزەکە و بێ ئەوەی ورتەی لە زاری بێتە دەرێ، وەدەرکەوت. چەند خولەکێك دواتر ئانیا باوکی بینی کە

شانبەشانی ژنێك بە شێوازی (گراند ڕود) سەمای دەكرد. ئەڵبەتە كەمێك ئەملاولای دەكرد و لەتری دەدان و بەهۆی قورس هەڵسوڕانی سەمای هاوتاكەیەوە پرتەوبۆڵەی بوو. ئانیا، سێ ساڵ پێشتری هاتەوە یاد كە باوكی لە كۆڕێكی سەمادا وەك ئێستا لەتری دابوون و بۆڵاندبووی. ئیدی ئەوەبوو پاسەوانێك تا ماڵێی بردبۆوە و بەیانییەكەشی بەڕێوەبەری خوێندنگا هەڕەشەی لەسەر كار لابردنی لێ كردبوو. چ یادەوەریەكی ناوەخت و نابەجێ!

خانمە دەسڕەنگینەكان، دوای ئەوەی كە سەماوەرەكانیان كوژاندنەوە، شەكەت و ماندوو، ئەو پارەیەی كە پەیدایان كردبوو خستیانە دەستی ئەو خانمە بەتەمەنەی كە دەتگوت بەردێكیان خستۆتە دەمیەوە. ئارتینۆڤ دەستی خستە دەستی ئانیاوە و ئەوی بەرەو تەلارێك برد كە بە خۆشیی و شانازیی بەشداربووان، مێزی ئێوارێیان لێ ڕازاندبۆوە. نزیكەی بیست كەس - نەك زیاتر - بانگێشتی نان خواردن كرابوون كەچی سەرباری ئەوەش دەنگەدەنگیان زۆر دەهات. جەنابی پایەبەرز پێكەكەی خۆی بڵند كردو ئەمەی گووت: (( جێگای خۆیەتی لە سەر ئەم خوانە ڕازەوەیە، بۆ ڕازاندنەوە و بەرەكەتی خوانی هەژاران، كە ئامانجی ئێمە بوو لەم شەونشینییەدا، پێكێك هەڵدەین)). پاشان سەرتیپێك پێشنیاری كرد: بە سەلامەتی (( هێزێك كە تەنانەت تۆپخانەش خۆی لە بەرامبەریدا ناگرێت )). پێكەكان هەڵدەن. هەموو پیاوەكان پێكەكانیان لە پێكی ژنەكان دا. شەوێكی یەكجار خۆش بوو!

ئەو كاتەی كە ئانیایان تا ماڵێ ڕەوان كردەوە سپێدەی دابوو، نۆكەر و كارەكەرەكان بۆ كڕینی پێداویستیەكانی ڕۆژانە چووبوونە بازاڕ. ئانیا شاد و مەست و ماندو و لێوانلێو لە یادەوەریی، خۆی خستە سەر چارپاكە و دەسبەجێ خەوی لێ كەووت.



نزیكەی دەمژمێر دوی دوانیوەڕۆ بوو كە خزمەتكارەكەیان بێداری كردەوە و پێی ڕاگەیاند ئارتینۆڤ هاتۆتە سەردانی. ئانیا بەپەلە لیباسەكانی لەبەر كرد و چووە ژوری میوان.

شتێكی ئەوتۆ بەسەر هاتنی ئارتینۆڤدا تێنەپەڕیبوو كە جەنابی پایەبەرزیش بۆ دەربڕینی ڕێز و پێزانینی خۆی بۆ ماندوبوون و بەشداریی كردنی ئانیا لە ( بازاڕی خێرخوازیی ) و سوپاس كردنی، خۆی بە ژورێدا كرد. لە حاڵێكدا كە بە نیگایەكی شیرن و پڕ لە ڕیاكارییەوە لێی دەڕوانی و لێوەكانی لێكدی دەسوی، دەستی ئانیای ماچ كرد و داوای لێ كرد جارێكی تریش مۆڵەتی سەردانەوەی پێ بدا و پاشان ڕۆیشت.

ئانیا، تاساوو و شڵەژاو، وەك ئەوەی ئەفسونی لێ كرابێ، لە چێگای خۆی وشك بوو. باوەڕی نەدەكرد بە شێوەیەكی ئاوا سەیر گۆڕانكاری بەسەر ژیانیدا هاتیێ. دروست لەو كاتەشدا میدیست ئەلیكسییجی مێردی خۆی بە ژوری میوانانداكرد ... تەنانەت ئەویش بە قیافەیەكی شیرن و گوێرایەڵانە و خزمەتكارانەوە - كە تەنیا لە خزمەت كەسانی ناسراو و پایەبەرزدا خۆی بەو شێوەیە دەنواند - لەبەرامبەر ژنە گەنجەكەی دا ڕاوەستابوو. ئانیا سەرنجێكی لێوانلێو لە غرور و بێ باكیی و نەفرەت و سوكایەتی لێ كرد - ئیدی دڵنیابوو لەوەی كە هەرگیز لەسەر شتی لەو چەشنە سەركۆنە ناكرێ - گووتی:

- بڕۆ ون بە ! گەمژە!

ئیدی لەوە بەدوا ئانیا دەرفەتی ئەوەی نەبوو سەری خۆی بخورێنێ، بەردەوام یان بانگێشتی گەشت و سەیرانیان دەكرد یان پیاسە و گەڕانی نێوشار و دەوروبەری، یان شانۆ ... هەموو شەوێ دەچووە دەرێ و لای بەرەبەیان دەگەڕایەوە ماڵ، لەبری ژووری نووستن، لە ژوری میوان لەسەر زەویەكە لێی دەكەوت و هەرلەوێ خەوی لێ دەكەوت و پاشان بە دەنگ و دەربڕینێكی گەرم و شیرن و

دڵنشینەوە بۆ هەموانی دەگێڕایەوە کە چۆن شەوێ لە نێو گوڵ و گوڵزاردا نوستوە. ئیدی ئێستا پێویستی بە پارەی باش بوو، بەڵام لە میدیست ئەلیکسییج نەدەترسا، بەکەیفی خۆی پارەی مێردەکەی - وەك ئەوەی هی خۆی بێ - خەرج دەکرد. ئیدی بە پێویستی نەدەزانی داوای پارەی لێ بکات بەڵکو وەسڵی ئەو شتانەی کە دەیکڕین بە یاداشتێکی لەم شێوانە دەینوسین : ((دوسەد ڕۆبڵ بدەرە هەڵگری ئەم نوسراوە )) یان ((بێ دواکەوتن سەد ڕۆبڵ بنێرە)) و بۆ میدیست ئەلیکسییجی دەنارد.

***

میدست ئەلیکسییج، بە بۆنەی جەژنی پاکەوە، شانازی وەرگرتنی مەدالیای ژمارە دووی ئاننای پیرۆزی پێبڕا. بە مەبەستی سوپاس و پێزانین چووە لای جەنابی پایەبەرز، جەنابی پایەبەرزیش ڕۆژنامەکەی دەستی تووڕ دایە لایەك و لەسەر مۆبڵەکە خۆی ڕێکخستەوە و لە حاڵێکدا کە چاوانی بڕیبوونە دەستە سپی و نینۆکە سورەکانی خۆی، گووتی:

- ئیدی لێرە بەدوا جەنابت بوویتە خاوەنی سێ دانە ئاننا، یەکیان بە یەخە و دوانیشیان بە گەردەنتەوە.

میدیست ئەلیکسییج بە دوو پەنجە لێوەکانی خۆی گرت نەبادا بداتە تریقەی پێکەنین و وەڵامی دایەوە: - کەواتە لێرە بەدواوە دەبێ چاوەڕوانی لە دایکبوونی (فلادیمیر*) ێکی چکۆلە بم. گەرچی بێشەرمیشە لە خزمەت بەرێزتاندا بەڵام تکام وایە جەنابت ببیتە (باوکی تعمیدیی) بۆی.

میدیست ئەلیکسییج لەم قسەیە مەبەستی لە وەرگرتنی مەدالیای ژمارە چواری فلادیمیر بوو. ئێستا دەیهێنایەوە یادی خۆی کە چەندە بە جوانی توانیبووی لە خزمەت جەنابی پایەبەرزدا حازربەدەست بێ و دەسبەجێ بەو



شێوەیە وەڵامی بداتەوە. کە پاشان ئەمەی بە ئاووتاوەوە بۆ هەمو کەس دەگێڕایەوە. دەیویست دیسانەوە شتێکی تری لەو بابەتە لە خزمەت جەنابیدا دوبارە بکاتەوە، بەڵام جەنابی پایەبەرز - کە ئاگای لەوی بڕابوو و چووبۆوە سەر خوێندنەوەی ڕۆژنامەکەی - بە ئاماژەی سەر وەدەرێی نا.

ئانیاش بەردەوام بەسواری گالیسکە دەگەڕا، پێکەوە لەگەڵ ئارتینۆڤدا دەچوونە ڕاوێ، لە نمایشە یەك پەردەییەکاندا ڕۆڵی دەگێڕا، بانگێشتی نانی ئێوارێ دەکرا و بەدەگمەن سەری لە باوك و براکانی دەدا و ئەوانیش بەبێ ئانیا نانی نیوەڕۆیان دەخوارد. پیوتەر لیۆنتیجی باوکیشی لە جاران زیاتر ملی لە خواردنەوە نابوو، ئەسپێ لە گیرفانیدا سەوزەڵە خانمی دەگووت. ئۆرگەکەشی فرۆشتبوو تا یەکێك لە قەرزەکانی پێ بداتەوە. پتیا و ئەندریۆشا نەیاندەهێشت بە تەنیا بچێتە دەرێ و بەردەوام چاودێرییان دەکرد نەکا بەربێتەوە و هەرکاتێ کە ئانیایان لە شەقامی ستارۆکییێڤسکایا بەسواری گالیسکەوە - کە لەبری گالیسکەڕان ئارتینۆڤ خۆی دەیئاژۆت - بینیبا، پیوتەر لیۆنتیج کڵاوە ڕەنگاوڕەنگەکەی لەسەری دادەگرت و هەوڵی دەدا بەدەنگی بەرز شتێك بڵێ بەڵام پتیا و ئەندریۆشا قۆڵیان دەگرت و بەپاڕانەوەوە دەیانگوت:

- بەسە باوکە گیان ... پێویست بەوە ناکا باوکە ...

بۆ وەرگێڕانی ئەم چیرۆکە سودم لەم دو سەرچاوەیە وەرگرتووە:

1- مجموعه داستانهای کوتاه چخوف / مترجم سروژ استپانیان / انتشارات توس

2- انا به گردن / مترجم مهندس کازم انساری

( پولکایی * ) جۆرە سەمایەکی خێرا و هاوکات لەگەڵ گۆرانییەکەیدا.

( مازۆرکا * ) یەکێك لە سەما میللییەکانی پۆڵەندا.

( فلادیمیر* ) ناوی منداڵی نێرینە و ناوی مەدالیایەکی سەردەمی ڕوسیای بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر

## ئــة مــريــكــا يـــيــا نـــة

بەهۆی ئەو پێداگریە سەختەی کە بۆ زەماوەند کردنێکی یاساییانە هەمە، وە بە سەرنجدان لەوەی کە زەماوەندکردن بەبێ بەشداریی ڕەگەزی مێیینە کارێکی مەحاڵە، لەخۆبووردوانە و بەوپەڕی شانازی و شادمانی و هەستکردن بە ڕەزامەندیی تەواوە داوا لە سەرجەم بێوەژنان و کچان دەکەم بفەرموون ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- سەرەتا لەبەر ئەوەی کە پیاوم، ئەم بابەتە بۆ خانمان گرینگی خۆی هەیە. باڵام دو ئارشین و هەشت ڤیرشۆك واتا (176 ) سانتی مەترە. گەنجم. هێشتا بۆ سەردەمی پیری زۆرم بەبەرەوە ماوە. دروست بە ئەندازەی نێوان باڕۆکە لە جەژنی پتروس. لە ڕەگوڕەچەڵەکێکی باشم. جوان نیم بەڵام زۆریش ناشیرن و دزێو نیم. بەڵگەشم بۆ ئەوەی کە ناشیرن نیم ئەوەیە زۆر جاران لە تاریکایی ئەنگوستەچاودا منیان بە کەسانی زۆر جوان لێ گۆڕاوە. ڕەنگی چاوەکانم لە نێوان شین و قاوەیی دان. سەر گۆناکانم (بەداخەوە) چاڵیان تێ ناکەوێ. دو دانە لە ددانە شاش و واشەکانم ڕزیون. لە بەخێرهێنانی میوانان و هەواڵپرسیی دا لێزان نیم بەڵام ڕێگاش بە هیچ داماو و زەبوونێك نادەم شکی لە پتەویی و بەهێزیی ماسولکەکانم هەبێ. ژمارەی دەستەوانەکانم حەوت و سێ لەسەر چووارن. جگە لە دایك و باوکێکی هەژار بەڵام خانەدان، هیچ شتێکی ترم نییە.



بەڵام ئایندەم ڕوون و درەوشاوەیە. لایەنگرێکی سەرسەختی نازدارانم بەگشتی و خزمەتکارانیش تاکوتەرا. باوەڕم بە هەموو شتێك هەیە. گونجانم لە گەڵ مەقولەی ئەدەبیات دا بە ئەندازەیەکە کە لە خوێندنەوەی ستونی سندوقی پۆستەی گۆڤاری (سترکازا) بەدەگمەن گریان دەمگرێ. بەنیازم لە ئایندەدا ڕۆمانێك بنوسم کە پاڵەوانەکەی (ژنێکی جوانی گوناهکار و لامل) و هاوسەری ژیانی جەنابم دەبێ. لە شەو و ڕۆژێکدا دوانزە دەمژمێر دەنوم. زۆر خۆرم. تەنیا لەگەڵ هاوەڵان دا دەخۆمەوە.  ئاشنایەلی باشم هەن، دوانیان نوسەر و یەکیان شاعیر و یەکیشیان مفتەخۆرە و هەرسێکیشیان لە ڕێگەی ڕوپەڕەکانی ڕۆژنامە شەریفەکەی (ڕیڤسکایا گازیتا) وە سەرگەرمی فێرکردن و باشتر کردنی بەنی ئادەمن. ئەو شاعیرانەی خۆشمدەوێن بریتین لە پۆشکاربۆف و هەندێك جاریش خۆم. عاشقی پیشەکەمم بەڵام بەخیل نیم. دەمەوێ بە پێی مەرجەکانی خۆم و خوازیارانم زەماوەند بکەم.

ئەمە تایبەتمەندیەکانی بەندە بوو، ئەمەش تایبەتمەندیەکانی هاوسەری ئایندەم:

- کچ بێ یان بێوەژن (ئیدی کامیان گونجاوتر بێ) دەبێ تەمەنی لە پانزە ساڵ بەسەرەوە بی و لە سی ساڵیش زیاتر نەبێ. کاسۆلیك نەبێ. واتا دڵنیابێت و سور بزانێ لەم دنیایەدا مرۆڤی بێبەری لە گوناه، بوونی نییە.  یەهودییم ناوێ. کچە یەهودییەکان هەمیشە لە پیاو دەپرسن: (بۆچی ئەم دێڕە لە ناوەڕاست دەنوسی؟). (بۆچی ناچی لەلای باوکم فێری شێوازی پارە پەیدا کردن بیت؟). ئەم چەشنە قسانە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ سروشتی مندا نایەنەوە. دەبێ پرچ زەرد و چاوشین بێ. ئەگەر کرا (برۆ ڕەش بێ). نە ڕەنگ لێ بڕاو و نە سورەش بێ. نە قەڵەو بێ نە لاواز. نە بالای زۆر بەرز بێت و نە کورتەبنە. دەبێ لەبەردڵان بێ و ڕەزای قورس نەبێ. سەری هەڵنەقاچییێ. هەڵەوەڕ نەبێ و بەردەوامیش لە کونجی ماڵ دانەنیشێ. وە هەروەها خەتیشی خۆشیێ چوونکە زۆر پێویستیم بە

کەسێکی لێهاتوە بۆ لەبەر نوسینەوە، ئەڵبەتە ئەویش هێندە زۆر نییە. دەبێ ئاشنایەتی لەگەڵ ئەو گۆڤارانەدا هەبێ کە من هاوکاریانم و ئامانجی ئەوانیش بکاتە سەرمەشقی ژیانی خۆی. گۆڤارەکانی وەك ( شادمانی ) و ( تازەگەلی رۆژ ) و ( نا نا ) نەخوێنێتەوە و خوێندنەوەی سەروتارەکانی ( نامەکانی مۆسکۆ ) ش کاریگەری لسەر دانەنێ و بێزوش بە خوێندنەوەی سەروتارەکانی ( کەنار ) وە نەکا و سست و بێ توانا نەبێ.

دەبێ توانای گۆرانی گوتنی هەبێ، سەما بکا، بنوسێ، بکولێنێ، ببرژێنێ، زمان شیرین بێ، کێك و کولیچان دروست بکا، ( بەلاّم دارکاریی نەکا )، قەرز بۆ پیاوە خۆشەویستەکەی بکا، بە گوێرەی توانا جوانپۆش بێ، لە هەموو لایەنەکانەوە گوێڕایەڵ بێ.  نابێ لەشی خۆی بخورێنێ، بیکاتە جیڕوهۆڕ، بزیقێنێ، هاوار بکا، گاز بگرێ، چنگ و ددانەکانی نیشان بدا، دەفروئامانان بشکێنێ، نابێ خۆی لە دۆستان پێ گەورەتر بێ و فیزیان بەسەردا لێدا. تێبگا لەوەی کە قۆچ شایستە و شایانی مرۆڤ نییە و بۆ کەسێك کە بۆ وەدەسهێنانی ئەم دەسکەوتانە خۆی دەخاتە ژێر بارێکی ئاواوە، تا کورتتر بێ باشترە و مەترسیی کەمترە.

نابێ ناوی (ماترینا) یان (کۆلینا) یان (ئاڤدۆتیا) و ئەم جۆرە ناوانە بێ. وا باشترە ناوێکی خانەدانانەی لە چەشنی (ڤیلیا)، (لینۆچکا)، (ماروسکا)، (کاتیا) و (لیپا) و ئەمانەی هەبێ.

دووری نێوان ئەو و دایکی کە دەکاتە خەسوی بەندە بە ئەندازەی ئێرە و پشت کێوی قاف بێت

( بە پێچەوانەوە بەندە هیچ گرێنتیەك نادات ).

بوونی لانیکەم 200000 رۆبڵ زیو لە شتە هەرە پێویستەکانە



لێتان ناشارمەوە لە حاڵەتی ڕازیبوونی خوازیارانمدا دەکرێ ئەم برگەی دواینیان گۆڕانکاری تێدا بکرێت.

سەرچاوە / مجموعە داستانهای کوتاه چخوف / سایتی کتابناک

# نـــا نــخـؤ ر ة كـــا ن

**میخائیل پیترۆڤ زۆتۆڤ، وردە بۆرژوایەکی حەفتا ساڵە - پیرەمێردێکی لێکەوتە و تاك و تەنیا - لە سەرمان و لە تاو ئازاری جومگەکانی لەشی خەبەری بۆوە. هێشتا ژورەکەی تاریك بوو، ئەو چرایەی کە بە تایبەتیی لە خوار شەمایلی قەدیسەکان دانرابوو، کوژابۆوە. چمکێکی پەردەی پەنجەرەکەی لادا و سەیری دەرێی کرد. ئەو هەورەی کە یەکپارچە ئاسمانی تەنیبوو، خەریکبوو وردە وردە سپی هەڵدەگەڕا. خەریکبوو دونیا ڕوناك دەبۆوە. پێدەچوو دەمژمێر پێنجی بەیانی بێ.**

**زۆتۆڤ، لەسەرمان خۆی کورژ کردبۆوە و بەدەنگەدەنگ و کۆخەکۆخەوە لەنێو جێگاکەی هەستا. وەك پیشەی لەمێژینەی، ماوەیەك دەستەونزا بەرامبەر شەمایلی قەدیسەکان ڕاوەستا. چەند نزایەکی - کە هێشتا لەبیری مابوون - لە ژێر لێوەوە خوێند و داوای بەزەیی و بەخشینی بۆ لیستێکی دور و درێژ لە کەسوکارە مردوەکانی کرد. ئیدی هیچ کات، بیری لە هیچ کام لە کەسوکارە مردوەکانی خۆی نەدەکردەوە، تەنیا لەسەر ئەو شێوە نزاکردنە ڕاهاتبوو و خوی پێوە گرتبوو. وەك ڕۆژانی تر ژورەکە و بەرماڵێی گەسك دا و سەماوەرە خەڵوزییە چکۆلە و نێوقەد ئەستورە پێچکەدارە لە مزی سور دروستکراوەکەی داگیرساند. ئەگەر هاتبا و ئەم پیرەمێردە خوی بەم کارانەوە نەگرتبا ڕون نەبوو ڕۆژانی پیریی خۆی بە چ شێوەیەك بە تاقی تەنیا بەسەر دەبا.**

**سەماوەرە چکۆلەکە خەریکبوو وردە وردە وەجۆش دەهات تا لە ناکاو بە دەنگێکی گڕ و لەرزۆکەوە دەستی کرد بە گیزەگیز. زۆتۆڤ لەژێر لێوەوە بۆڵاندی:**

**- دیسانەوە دەستت پێکردەوە!**

**هاتەوە یادی کە شەوی ڕابردو خەونی بە زۆپاوە بینی بوو. خەونەکەی، جگە لە توشبوون بە خەموخەفەت و گرفتاریی، هیچ لێکدانەوەیەکی تری بۆ نەدەکرا. تاکە هۆکاری بیرکردنەوەی، تەنیاوتەنیا بینینی خەون و نیشانەکانی بوون. ئەمجارەشیان بە حەزو ئارەزویەکی تایبەت بە خۆیەوە کەوتە نێو دەریای بیرکردنەوەوە تا وەلاّمێك بۆ ئەم دو پرسیارەی خوارەوە بدۆزێتەوە: گیزەگیزی سەماوەر لە خەوندا چیە و زۆپاش هەواڵی چ خەم و پەژارەیەکی پێیە؟ لێکدانەوەی خەونەکەی، هەر لە چرکساتەکانی یەکەمی ئەو بەیانییە، وەڕاست گەڕا. ئەو دەمەی قۆریەکەی پڕ لە ئاو کرد و ویستی چای وەسەرنێ، قتوی چایەکەی بە بەتاڵیی بینی. چەند گوێچکە نانی ڕەشی خستە دەمیەوە و کەوتەجوینیان و لەبەرخۆیەوە بە پرتەوبۆڵەوە گوتی:**

**- توخوا ئەمەش بوو بە ژیان؟ سەت خۆزگە بە ژیانی دورخراوەکان! ژیانی سەگ زۆر خۆشترە لەم ژیانە! ئەگەر لادێییەکی سادەش بووایەم بە هەرحاڵ بەلاّم بە ناخێری گیانم لای خۆی لە بنەماڵەیەکی باشم، خانوی خۆمم هەیە. بەڕاستی جێگای شەرمە!**

**بەدەم پرتەوبۆڵەوە، باڵتۆکەی کردە بەر و پێڵاوە گەورەکانی - کە ساڵی** 1867 **پێڵاودورێك بە ناوی پرۆخۆریج بۆی دروستکردبوو - کردەپێ و چووە نێو حەوشێ. ئاسمان هەوراوی و کەشوهەوا سارد و ئارام و لە هەمان کاتیشدا گرژ**

بوو. حەوشە گەورەکەی کە بە بڕکە شەکەرۆك و گەڵای زەردی پایز داپۆشرابوو، لەنێو بەستەڵەکی ڕوکەشانەی بەر لە هاتنی وەرزی زستان، هەندێك زیوبین خۆی نیشان دەدا.

نە بایەك، نە دەنگێك.

لە هەیوانی خانوەکەیدا - کە بەلایەکدا لار ببۆوە - دانیشت و هەر لەو کاتەشدا شتێك ڕویدا کە ڕۆژ نەبوو ڕونەدات: لیسکا، واتا سەگە زلەکەی ماڵێ، بەخێرایی بەرەو لای هات. لیسکا، سەگێکی یەکچاو و بازە و مردەلۆخ بوو. بە پشتێکی لە برسان چەماوە و ترسولەرزێکی زۆرەوە - کە دەتگوت پێ دەنێ بەسەر پشکۆدا - لێی نزیك بۆوە. هەمو ئەندامە بێ توانا و داهەزاوەکانی جەستەی، گوزارشتیان لەوپەڕی داماویی و ئازار و ڕەنجێکی زۆر دەکرد.

زۆتۆڤ سەرەتا گوێی پێ نەدا بەڵام هەرکە لیسکای پیر بە کلکەسوتێ و بێحاڵیی و ترسەوە کەوتە لستنەوەی پێڵاوەکانی ، وردە بۆرژوای پیر بە توڕەییەوە قاچەکانی کوتا بە زەوی دا و هاواری کرد:

- چغە! بە تۆپین چیت! نەفرەتی!

لیسکا، لێی کشایەوە، هەڵتوتا و تاکە چاوەکەی بڕیە خاوەنە پیرەکەی.

زۆتۆڤیش هەروا بەردەوام بوو:

- نەفرەتینە! بەس لە ئێوەم کەم بوو ژیانم لێ بکەنە قوزەڵەقورت!

ئەمەی گوت و بە نیگایەکی پڕ لە بێزاریەوە ڕوانییە ئەو عەمبارەی کە گیا لەسەربانەکەی شین ببوو و بەلایەکدا شانی دادابوو. لە کەلێنی دەرگای عەمبارەکەوە کەللەسەری زلی ئەسپێکی بینی کە لەوی دەڕوانی، دەتگوت بەهۆی گرینگیی پێدانی خاوەنە پیرەکەیەوە گیانی بەبەردا هاتۆتەوە، جوڵەیەکی کرد و کەمێك هاتە پێشتر و ساتێك دواتر ئەسپێکی پیری لەڕ و ترساو و زگ بە پشتەوە نوساوی چەشنی لیسکا، لە عەمبارەکە هاتە دەرێ. چووارپێیەکی



ڕەنگ سپی و لەڕ و لاواز و قاچەکانی باریك و زگی بە پشتیەوە نوسابوو. لە عەمبارەکە هاتە دەرێ و هاتە نێو حەوشەکە بە حاڵەتێکی تێکەڵ بە شك و گومانەوە - وەك ئەوەی هەست بە خەجاڵەتیی بکا - لە سەرەخۆ دەڕۆیی. زۆتۆڤ دیسانەوە دەستی پێ کردەوە:

- ئەی خۆزگە دەتۆپیت! دەموسەعات لەبەردەممدا قوت دەبیەوە، هەی فیرعەون! پێدەچی حەزت لە کاووجۆ بێ ...

لێرەدا ماسولکەکانی ڕوخسارە گرژ و توڕەکەی، بە زەردەیەکی تەوساویی و لێوانلێو لە نەفرەتەوە وێك هێنانەوە و درێژەی پێدا:

- پەلە مەکە! هەر ئێستا! بۆ ئەسپێکی خۆشڕەو و بەنرخی وەك تۆ تا دڵت دەیەوێ جۆم وەسەریەك ناوە! فەرموو وەرە بخۆ! هەر ئێستا! بۆ سەگە بە هەیکەل و نازەنینەکەشم هێندێك شتم لاداوەتە لاوە. ئەڵبەتە سەگە نازەنینەکەم ئەگەر حەزت لە نانی ڕوت نییە ئەوا گۆشتی گۆلکت بۆ دێنم.

سەرەڕای ئەوەی کە ڕق و توڕەییەکەی تا دەهات زیاتر تاوی دەسەند، زیاتر لە نیو دەمژمێر پرتاندی و بۆڵاندی، سەرەنجام چیتر نەیتوانی دان بەخۆی دا بگرێ و بەر بە لافاوی ئەو ڕق و توڕەییە بگرێ کە لە دەرونی دا پەنگی دابۆوە، هەستایە سەرپێ و پێڵاوەکانی تاپ تاپ کوتا بە زەوی دا و بە دەنگێکی بەرزەوە کە لە سەرتاسەری حەوشەکە دەنگی دەدایەوە، هاواری کرد:

- مفتەخۆرینە! هەی کرمینە! ئەرکی من نییە زگتان تێرکەم! خۆ لە سەر خەزێنە دانەنیشتوم تا دەڕۆستی بەخێوکردنی ئێوە بێم! بارگیرە پیرە نەفرەتیەکان، خۆم نان نییە بیخۆم! ئەك سندانتان لێدا! نە سودتان بۆم هەیە، نە دڵم پێتان خۆشە، جگە لە خەم و خەفەت و ماڵوێرانیی چی ترم لێتان دەسدەکەوێ! نازانم بۆچی ناتۆپن؟ نازانم دەبێ ئێوە ئەوەندە شتێکی گرینگ بن

کەوا  ئیزرائیل لە بیری کردون؟ بکەم بە گۆڕی بابتانەوە، دەی بڕۆن بۆخۆتان خۆتان بژیەنن. ئیدی زگی ئێوەم پێ تێر ناکرێ. بەسە وازم لێ بێنن!

لێرەدا زۆتۆڤ توڕە بوو، لە پێستی خۆی چووە دەرێ بەلاّم ئەسپ و سەگەکە هەر لە شوێنی خۆیان ڕاوەستابوون و گوێیان دابووە قسەکانی. بەدروستی نازانم کە ئایا ئەو دو نانخۆرە دەیانزانی ئەو سەرکۆنەکردنەیان تەنیا لەپای پاروەنانێکە! یان نا!، بەلاّم دلّنیام لەوەی کە زگیان زیاتر و زیاتر بەخۆیانەوە نوساند و خۆیان خڕ کردەوە و قیافەی ستەملێکراو و خەمبارانیان بەخۆوە گرت.

زۆتۆڤ، بە بینینی دەموقەپۆزی گوێڕایەلاّنەیان زیاتر ڕقی هەستا و هەلّچوو و هاواری کرد:

- بۆ دەرێ! گۆڕتان گوم کەن! ئیدی نامەوێ چاوم بە چارەتان بکەوێ! ئەرکی من نییە نان بدەمە هەموو کەللەپوتێك! دەی بۆدەرێ!

پیرەمێرد، لەکاتێکدا کە قاچەکانی تێك دەئالاّ، بەرەو لای دەرگای حەوشە ڕۆیشت و کردیەوە، پاشان لقەدارێکی وشکی لە سەر زەویەکە هەلّگرتەوە و کەوتە دەرکردنی ئەو دو نانخۆرە. ئەسپەکە سەری ڕاوەشاند و شانەکانی ڕاتەکاند و بە شەلەشەل بەرەو دەرگای حەوشەکە کەوتەڕێ، سەگەکەش بەدوای دا. هەردوکیان چوونە کۆلاّنێ، چەند هەنگاوێك لە حەوشەکە دور کەوتنەوە و لەبەرامبەری ڕاوەستان. زۆتۆڤ بە جنێوان دەستی پێکرد:

- بەوەلاّ دەتان تۆپێنم.

دوای ئەوەی هەردو نانخۆرەکەی لە مالّ دەرکرد، تا ڕادەیەك ئارام بۆوە و دەستی کرد بە شۆرین و خاوێن کردنەوەی حەوشەکە. لەو کاتەشدا جار جار سەیرێکی کۆلاّنێی دەکرد: ئەسپ و سەگەکە وەك ئەوەی بە زەویەوە داکوترابن، ڕاوەستابوون و نیگای تێکەلّ بە ئازاریان بڕیبووە دەرگای حەوشەکە. پیرەمێرد، کە تا دەهات ڕقەکەی تاوی دەسەند،  لە ژێر لێوەوە بۆلاّندی:



- دەی ئێستا بزانم بێ من چۆنتان خۆ پێ بەڕێوەدەچێ! لێگەڕێ با یەکێکی تر نان و ئاوتان بدا! من هەم ناکەسبەچەم هەم بەدخو ... ژیان لەگەلّ مندا هیچ نەرمی و میهرەبانییەکی تێدا نییە ... وا باشترە بۆ خۆتان بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر ... بەلّێ ...

دوای ئەوەی کە تێر بە دلّی خۆی بۆلاّندی و چێژی لەسەیرکردنی سیمای داماو و گوناهی نانخۆرەکان وەرگرت، چووە کۆلاّنێ و بڕۆکانی وێکهێنانەوە و هاواری کرد:

- چیە ئێستا بۆ لەوێ ڕاوەستاون؟ چاوەڕوانی کێن؟ بۆچی ئەو ڕێیەتان گرتوە؟

هەردو ئاژەلّەکە سەریان داخست و بە قیافەیەکەوە کە گوزارشتی لە بەستەزمانیی و داماوییان دەکرد، بەرەو دەرگای حەوشەکە هاتنەوە. لیسکا، کە پێدەچوو خۆی بە شایانی بەخشین نەزانێ، نوزەیەکی دلّتەزێنی کرد. زۆتۆڤ کە ڕێگای هاتنەژورەوەی بۆ ئەو دو ئاژەلّە دەکردەوە، گوتی:

- دەتوانن لێرە بمێننەوە بەلاّم هیچ هەوالّێك لە خۆراك و ئالیك ... لێرەدا بە نیشانەی ( نییە ) پەنجەیەکی ڕاوەشاند  ... تەنانەت ئەگەر لە برسانیش بمرن هیچم نییە بتان دەمێ!

لەو نێوەدا خۆر، خەریکبوو وردە وردە بوومەلێلّی بەیانی کالّ دەکردەوە و تیشکە لارەکەی دەکەوتە سەر توێژە بەفرە ناسکەکانی وەرزی پایز. دەنگی پێ و دەنگی گفتوگۆیەك، کەوتە بەرگوێ. زۆتۆڤ گەسکەکەی لە شوێنی خۆی دانایەوە و بەرەو لای مالّی دراوسێکەی ( مارك ئیڤانیچ ) کەوتەڕێ. مارك ئیڤانیچ کە باوکی تەعمیدیی منالّەکانی بوو، دوکانێکی بچووکی بەقالّی لەمالّەکەی خۆیدا دانابوو. کاتێ زۆتۆڤ گەیشتە دوکانەکەی، لەسەر کورسیەك - کە دەنوشتێنرایەوە - دانیشت، بە ئارامی ئاهێکی هەلّکێشا و لاوانەوەئاسا دەستێکی بە ڕیشی خۆی دا هێنا و سەری قسەی بە باسی کەشوهەوا کردەوە،

دواتر لەبارەی شماسە نوێیەکەی کلیسا و پاشان لەبارەی سرودبێژەکانی کلیساوە و کەوتنە قسان و دەستیان بە گفتوگۆ کرد. هێند بە قوڵی ڕۆچووبوونە نێو گفتۆگۆوە هەستیان بە تێپەڕینی کات نەدەکرد. کاتێ شاگردی دوکانەکە، کتریە ئاوێکی کوڵاوی هێنا و هەردوکیان کەوتنە چاخواردنەوە، کات، چەشنی باڵندەیەکی تیژباڵ، بەخێراییەکی زیاترەوە دەڕۆیشت. زۆتۆڤ کە تا ڕادەیەك گەرم و کەم تا زۆرێك شاد بوو، دوای خواردنەوەی شەش پەرداخ چا، لەحاڵێکدا کە بە پەنجەکانی دەیکوتا بە سەر مێزەکەدا، گوتی:

- مارك ئیڤانیج داواکارییەکم لێت هەیە ... بێژم بە ... وەرە ئەو چاکەیەم لەگەڵدا بکە و ... ئەمڕۆش یەك دو مستە جۆم بدەرێ.

لەوسەر لای سندوقە چایە گەورەکەوە کە مارك ئیڤانیج لە پشتیەوە دانیشتبوو ئاهێك هاتە بەرگوێیان. زۆتۆڤیش درێژەی دایە:

- وەرە ئەو چاکەیەم لەگەڵدا بکە ... ئەمڕۆ چیتر چام لێت ناوێ، تەنیا یەك دو مستەجۆم بدەرێ ... لە ڕاست تۆ خۆم بە شەرمەزار دەزانم ... چی بکەم نەدارییە بەربینگی پێ گرتوم و تۆشم بێزار کردووە ... ئەو ئاژەڵە بەستەزمانانە خەریکن لە برسان دەمرن ...

مارك ئیڤانیج دوبارە ئاهێکی هەڵکێشایەوە و گوتی:

- دەتدەمێ ... بۆچی نا؟ بەلاّم دەمەوێ بزانم ئەو پیرە قۆترانەت بۆچی ڕاگرتوە؟ ئەگەر ئەسپەکەت بە کەڵکی سوارییی یان بەکەڵکی ژێربار هاتبا بەهەرحاڵ، بەلاّم ... تف! مرۆڤ بە بینینی شەرم دایدەگرێ ... ئەوە سەگەکەشت هیچ! بەس ئێسك و پێستی ماوەتەوە! نازانم بۆچی ئەوانە بەخێو دەکەی؟

- ئەدی چیان لێ بکەم؟



- بابە خۆ پێویست بە پرسیار ناکا ... بیانبە بۆ لای ئیگناتی قەساب و بڕایەوە! دەبووایە دەمێکبا ئەو ئاژەلاّنەت بە ئیگنات سپاردبا ... جێگای شیاویان ئەوێیە.

- قسەکەت ڕاستە ... لەوانەشە ...

- کەسێك بۆخۆی هیچی نەبێ بیخوا چۆن دەچێ دو ئاژەڵیش ڕادەگرێ. من لاریم لەوە نییە جۆت بدەمێ ... گرینگ نییە ... بەلاّم خۆ ئەمە ڕۆژێك و دوان نییە برا ... پێناچێ قەت هەژاریی تۆ کۆتایی بێت! ئەمڕۆ پێویستیت بە شتێکە، سبەی بە شتێکی تر، ئیدی نازانم کەی ئەمە کۆتایی دێت.

پاشان ئاهێکی تری هەڵکێشا و دەستێکی بە گۆنا سور هەڵگەڕاوەکانی خۆیدا هێنا و درێژەی پێدا:

- خۆزگە دەمردی! تۆ خۆشت نازانی بۆچی زیندوی ... بەخوا بەڕاستیمە! مادام ئیزرائیل لەبیری کردویت واباشترە بۆخۆت بچیتە پەرستگایەك یان پەناگایەك.

- بۆچی؟ خۆ من مرۆڤێك نیم لە کون و کەلێنان هاتبمە دەرێ! خزم و کەسم هەیە ... نەوەم هەیە ... ئیدی بە دووردرێژی کەوتە باسی ئەوەی کە لە دێیەکدا نەوەیەکی هەیە بەنێوی گلاشا و کچی کاترینی برازایەتی.

- ئەرکی سەرشانییەتی نانم بدا! سبەی بمرم ئەو دەبێتە خاوەنی ئەم خانوە، کەوابێ دەبێ بەخێومکا! دەچمە لای وی! دەزانی گلاشا کێیە؟ کچەکەی کاترین ... کاترین ئەو کچەی کە لە ژنەکەی تری پانتێلی برام بوو ... دەزانی کامە دەڵێم؟ ئەم خانوەی من دەبێتە موڵکی گلاشا ... کەوابێ دەبێ زگم تێرکا!

- باشە ئەدی بۆ ڕاوەستاوی؟ لەبری ئەوەی ئاوا دانیشی و بەتەمای خوا بژیت، دەبووایا دەمێکبا چووبایتە لای گلاشا.

- پێتوایە ناچم؟ خوا بەنەفرەتم بکا ئەگەر نەچم! ئەرکی سەر شانییەتی!

کاتژمێرێك دواتر، دوای ئەوەی ئەو دو هاوڕێ لەمێژینەیە بەسلامەتی یەکتر سەرو ئیستیکانێکیان هەڵدا، زۆتۆڤ لە ناوەڕاستی دوکانەکەدا ڕاوەستا و بە گەرمییەوە گوتی:

- شتێکی دەگمەنە، وا باشترە لەبری چەشتنی ئەو تەنیایی و برسێتیە بۆ خۆت بچیە لادێ.

- هەر ئێستا دەڕۆم! هەر بگەمە ماڵێیان پێی دەڵێم : خانوەکەم بۆ تۆ، با بۆ تۆ بێ! لەبری ئەوە ئاگات لە ورگم بێ و بەخێومکە ... ئەرکی سەرشانتە! ئەگەر بەخێویشم ناکەی، نە هەواڵێك لە خانوەکەم هەیە نە لە نزای خێرم ! خوداحافیز ئیڤانیچ!

زۆتۆڤ پێکێکی تری هەڵدا و لەخۆشی ئەو بڕیارە دابووی بەپەلە گەڕایەوە ماڵ ... بەهۆی ئەو ڤۆدکایەی خواردبوویەوە هەستی بە لاوازیی دەکرد و دونیا لەبەرچاوی دەسوڕا کەچی ڕانەکشا بەڵکو هەستا چی جلوبەرگی هەبوون هەموی کۆکردنەوە و خستنییە بووخچەیەکەوە و نزایەکی کرد و داردەستەکەی هەڵگرت و وەدەرکەوت. بەدەم پرتەوبۆڵە و کێشانی داردەستەکەی بە جادەکەدا و بێ ئەوەی ئاوڕ لە دوای خۆی بداتەوە، کۆڵانەکەی بڕی و خۆی لە دەشتێك دا بینییەوە. ئەو شوێنەی کە گلاشا لێی دەژیا، نزیکەی دە دوانزە کیلۆمەتر دوور دەبوو. بە جادە وشك و چۆڵەکەدا هەنگاوی دەنان و سەیری مێگەلەمەڕ و گاڕانەمانگای خەڵکی شاری دەکرد - کە لەنێو ئەو پوشوپەلاشەدا خەریکی لەوەڕین بوون. بیری لە گۆڕینی بەمەبەست و خێرای ژیانی خۆی - کە کاتژمێرێك پێشتر بنبڕانە بڕیاری لەسەر دابوو و دەیویست جێبەجێی بکا - دەکردەوە. لەم نێوەشدا ناخۆرەکانی خۆی لەبیر نەکرد. دوای چوونەدەرەوەی لەماڵ دەرگای حەوشەکەی بەکراوەیی جێهێشت تا ئەو دوانە خۆیان سەرپشك بن و کوێیان بەدڵبوو بچنە ئەوێ.



هێشتا کیلۆمەترێکی ڕێگا نەبڕیبوو کە لەناکاو لە دەواوە گوێی لە دەنگی پێ بوو. ئاوڕی دایەوە و دەستەکانی بەتوڕەییەوە ڕاوەشاند: لیسکا و ئەسپەکە گوێیەکانیان شۆڕکردبوونەوە و ساڵدانە ساڵدانە بەدوای ویدا دەهاتن. بەدەست ئاماژەی بۆکردن و گوتی:

- بگەڕێنەوە.

سەگ و ئەسپەکە لەجوڵە کەوتن و سەیرێکی یەکتریان کرد و دواتر چاویان بڕیە خاوەنەکەیان. زۆتۆڤ درێژەی بە ڕێگای خۆی دایەوە، سەگ و ئەسپەکەش بەدوایدا کەوتنەوە ڕێ. پیرەمێرد ڕاوەستا و کەوتە بیرکردنەوە. هەرچەندە زۆریش شارەزای تەبیعەتی گلاشای نەوەی نەبوو بەڵام نەدەکرا بەو دو ئاژەڵەوە بچێتە ئەوێ. دڵیشی نەدەهات بگەڕێتەوە و ئەو بەستەزمانانانە لە عەمبارەکەدا بەند بکات - هەرچەندە عەمبارەکەش هێندە دەرگایەکی قایم و پتەوی نەبوو تا لەوێدا بەندیان بکا. بیری کردەوە: (( لە عەمبارەکەدا دەمرن ... چۆنە لێرەوە یەکسەر بیانبەمە لای ئیگنات؟)).

ماڵی ئیگنات لە قەراغ لەوەڕگەکە، سەد هەنگاوێك لەولای ستونی بەربەستەکە دەوە بوو. زۆتۆڤ کە هێشتا نەیتوانیبوو بڕیاری کۆتایی بدا، نەیدەزانی چی بکا، بەرەو کوختەکەی ئیگنات کەوتەڕێ. سەری بەگێژەوە دەهات و بەری چاوەکانیشی تاریك دەبوو ...

ئیدی زۆتۆڤ شتێکی ئەوتۆی لەبارەی ئەوەی کە لە حەوشەی ماڵی ئیگنات ڕویدا، لەیاد نەماوە. ئەوەندەی لەبیرە هەرکە خۆی کرد بە حەوشەی ماڵی ئیگناتی قەساب دا، بۆنی توند و هەراسانکەری پێستە و بۆنی هەڵمی چێشتێکی ئیشتیابزوێن کە لە قاپەکەی بەردەم ئیگناتەوە هەڵدەستا، بە لوتیدا هات. دیسانەوە بە لێڵی و بەئاستەم دێتەوە یادی کە ئیگنات نزیکەی دو دەمژمێر ئەوی ماتڵ کردبوو، ئەڵبەتە لەو ماوەیەدا ئامادەکاریی بۆ ئەنجامدانی

کارێك دەکرد و خەریکی خۆگۆڕین بوو و لەگەڵ ژنێکی لادێییدا لەبارەی جۆرە ژەهرێکەوە قسەی دەکرد، دێتەوە یادی کە ئەسپەکەیان بردە بەردەم دەزگاکە، دەنگی دو لێدانی کپ - یەکەم دەنگ دەنگی لێدان لە کاسەی سەر و ئەوی تریش دەنگی بەلاداکەوتنی جەستەیەکی قورس - هاتە بەرگوێ. ئەو دەمەی لیسکاش بەبینینی مەرگی هاوڕێکەی بە وەڕینەوە شالاوی بۆ ئیگنات برد، دەنگی سێیەمین لێدانیش بیسترا و وەڕینەکە لە قوڕگیدا تاسا. ئەوەندەشی بە بیردێتەوە کە ئەو کاتەی لە دونیای شێتیی و مەستیی دا چاوی بە کەلەشی ئاژەڵە کوژراوەکان کەوت، بەرەو لای دەزگاکە ڕۆیشت و تەویلی پێوە نوساند.

پاشان تا شەوێ، پەردەیەکی لێڵ، وەها بەرچاوی گرتبوو کە نەیدەتوانی بەرپێیی خۆی ببینێ.

## ذنــي طةرِؤك

1

هەموو هاورێ و ئاشنا چاکەکان لە جەژنی بووکێنیی (ئۆلگا ئیڤانۆڤنا) دا کۆ ببوونەوە. ئۆلگا لە حاڵێکدا کە بە جوڵەی سەر ئاماژەی بە زاوا دەکرد و وەك ئەوەی بیەوێ پاساو بۆ زەماوەندکردنی خۆی لەگەڵ پیاوێکی سادە و ئاساییدا بێنێتەوە، ڕووی لە هاورێ و میوانەکان کرد و گووتی:

- ئەها سەیری بکەن: شتێکی تێدایە، وانییە؟

زاوا ( ئۆسیپ ستیپانیچ دیمۆڤ ) پزیشك و کارمەندێکی سادەی دەوڵەت بوو، لە دوو نەخۆشخانەدا خزمەتی دەکرد: لە نەخۆشخانەیەکیان وەك پزیشکی سەربەخۆ و لەوی تریان وەك پزیشکی بەشی توێکاریی. هەموو ڕۆژێ لە دەمژمێر نۆی بەیانییەوە تا نیوەڕۆ لە نەخۆشخانەیەکیان نەخۆشی دەبینی و پاشنیوەڕۆیانیش بەهۆی یەکێك لە هۆکارە گواستنەوە گشتیەکانەوە خۆی دەگەیاندە نەخۆشخانەکەی تر و توێکاریی جستەی مردوانی دەکرد. لە نۆرینگە تایبەتیەکەی خۆی شتێکی ئەوتۆی دەست نەدەکەوت - ساڵانە نزیکەی پێنسەد ڕۆبڵ. هەر ئەوەندە و تەواو. ئایا هیچ شتێکی تر هەیە کە پێویست بێ لەبارەیەوە بگوترێ؟ بەڵام ئۆلگا ئیڤانۆڤنا و ئاشنا و هاورێ باشەکانی لە مرۆڤە سادە و ئاساییەکان نەبوون. هەریەك لەوان کەم تا زۆر لە بوارێکدا



شایانی گرینگیی و بایەخ پێدان و کەم تا زۆر ناسراوو و بەناوبانگ بوون، ئەگەر تێیاندا هەبا ناو و ناوبانگێکی نەبا، ئەوا لانیکەم چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرا سبەی ببێتە کەسێکی ناسراوو و ناوبانگ دەرکا . ئەو هاورێ و ئاشنایانەی بریتی بوون لە: ئەکتەرێکی بەتوانا و لێهاتو و سیمایەکی لەمێژینە و ناسراوی شانۆی دراماتیك کە پیاوێکی جوان و قسەخۆش و زرینگ بێ فیز و خاوەن ئەدا و دەربڕینێکی جوانی شیعرخوێندنەوە بوو و ئۆلگا ئیڤانۆڤنای فێری هونەری دەربڕین دەکرد. یەکێکی تریان گۆرانیبێژی ئۆپێرا و پیاوێکی قەڵەو و دڵساف و چاکەخواز بوو و بەردەوام هەوڵی دەدا لە ئۆلگا ئیڤانۆڤنا بگەیەنێ کە خەریکە ئایندەی خۆی بە دەستی خۆی وێران دەکا و ئەگەر بێتو واز لە تەمەڵی و تەوەزەلی بێنێ و مەشق و خۆڕاهێنان بکات و بەسەر خۆیدا زاڵ بێ ئەوا لە ئایندەدا گۆرانیبێژێکی سەرکەوتوی لێ دەردەچێ. ئەوانی تر سێ چووار نیگارکێش و لەسەروی هەموشیانەوە (ژانریست و ئانیماڵیست و پیزاشیستێکی*) ناسراو بە (ڕیابۆڤسکی) بوو کە لاوێکی جوان و قژکاڵی تەمەن نزیکەی چلوپێنج ساڵ بوو کە توانیبووی لەچەندین پێشانگای شێوەکاریدا سەرکەوتن بەدەست بێنێ و دواهەمین تابلۆی خۆی بە بڕی پێنج هەزار ڕۆبڵ بفرۆشێ. دەسکاریی سکێچەکانی ئۆلگای دەکرد و دەیگووت لەوانەیە لە ئایندەدا شتێك بە شتێك بکا. هەروەها یەکێکی تر لە ئاشنا و هاورێکانی کەمانچەژەنێك بوو کە کەمانچەی وەگریان دێنا، لە هەموو کۆڕ و گردبوونەوەکاندا دانی بەوەدا دەنا کە ئۆلگا تاکە ژنە لەنێو سەرجەم ژنە ئاشناکانیدا کە توانای ئەوەی هەیە بە پیانۆکەی لەگەڵ کەمانچەکەی ئەمدا بڕوات. هەروەها لەنێو ئاشنا و هاورێکانیدا پیاوێکی گەنجی ئەهلی قەڵەم و ناسراویش هەبوو کە خاوەنی چەندین چیرۆك و شانۆنامە بوو. ئیدی کێی تر ماوە؟ ئەها! یەکێکی تریشیان ڤاسیلی ڤاسیلیچی خاوەن موڵك بوو کە بە

ئاشنایەتیەکی ڕوکەشانەی جۆرەکانی هونەرەوە، کاری ڕازاندنەوە و زێڕاوکردن و زەغرەفەی کتێب و ڕازاندنەوەی تابلۆیانی دەکرد، لایەنگرێکی سەرسەختی داستان و ئەفسانە و ستایلی کۆنی ڕوسیی بوو و نیگار و دیمەنی سیحراویی لەسەر کاغەز و فەخفوری و پشتە دەفری دوکەڵاویی دەنەخشاند.

لەم کۆڕ و گردبوونەوە هونەریە ئازاد و بەحوکمی چارەنوس بارودۆخ ناسکانەدا، سەرباری بالادەست بوونی جوانیی و ڕوخۆشیی و سادەیی، دیاربوو تەنیا لە کاتی ئازار و نەخۆشی دا پزیشکەکانیان بیر دەهاتەوە، ئەگینا کەسێکی وەك دکتۆر دیمۆڤ، دەبوو هیچ نەبێ بایەخ و گرینگیی کەسێکی بۆ نموونە ( سیدۆرۆڤ ) ناو، یان ( تاراسۆڤ ) ناوێکی هەبا. بەڵێ، دیمۆڤی بالابەرز و چووارشانە، لەو کۆڕ و گردبوونەوانەدا وەك کەسێکی بێگانە و زیاد و بچووك چاوی لێ دەکرا.

کە فراکی لەبەر دەکرد دەبووە کەسێکی تر، ڕیشە بچووکەکەشی مرۆڤی دەخستەوە یادی فرۆشیاری موغازەکان. ئەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین ئەگەر هاتبا و نوسەر یان نیگارکێش با، ئەوا بێ شك دەیانگووت ڕیشی لە ڕیشی ئێمیل زۆلا دەچێ.

کابرای هونەرمەند بە ئۆلگا ئیڤانۆڤنای گووت کە بەو قژە ساف و بریسکەدار و عەزبە سپییەوە، بالای لە درەختێکی هەلۆژەی جوانی سەرتاپا گوڵکردوی بەهاران دەچێ. ئۆلگا ئیڤانۆڤناش دەستی ئەوی گرت و گووتی:

- گوێ بگرە! چۆن دەکرا لەناکاو ئەم شتە ڕوو بدا؟ نا، گوێ بگرە ... دەبێ ئەوەت بۆ ڕوون بکەمەوە کە دیمۆڤ و باوکم هەردوکیان لە نەخۆشخانەیەکدا کاریان دەکرد. کاتێ ئەو باوکە داماوەم نەخۆش کەوت هەر ئەم دیمۆڤەی کە دەیبینی شەو و ڕۆژ بە دیاریەوە بوو و ئێشکی لێ دەگرت. دەزانی چ لەخۆ بووردیی و فیداکاریەکی نواند! گوێبگرە ڕیابۆڤسکی، هاوڕێی نوسەرم تۆش



گوێبگرە! ئەو ڕوداوەی بۆتانی دەگێڕمەوە زۆر سەرنج ڕاکێشە. وەرنە پێشتر. بەڕاستی بەوپەڕی دڵسۆزی و ڕاستگۆیییەوە فیداکاریی و لەخۆبووردویی نیشاندا! شەوانە منیش نەدەنوستم، بە تەنیشت چارپاکەی باوکمەوە دادەنیشتم، هەر ئەوکات وەك دەڵێن ئەو گەنجە دڵیرەم گیرۆدە کرد - دیمۆڤ خراپ دڵبەستەی من بوو. چارەنوس شتی سەیرسەیری لایە! دوای مردنی باوکم، جارجار دیمۆڤ دەهاتە سەردانم، هەندێك جاریش بە هەڵکەوت لە ڕێگاوباناندا توشی یەکتر دەبووین. سەرەنجام لە ڕۆژێکی خۆشدا ڕازی دڵی خۆی لا درکاندم و پێشنیاری زەماوەندی پێ کردم ... چەشنی بەفر بەسەرمدا باری ... سەرلەبەری ئەو ڕۆژە گریام بەلام خۆشم کەوتمە داوی عیشقیەوە و وەك دەبینن ئەمشەو زەماوەندی لەگەڵدا دەکەم. دەزانن من شتێکی تێدا دەبینم کە بەهێز و زەبەلاح و بەتوانا و تەنانەت دەکرێ بگوترێ ورچانەیە ... وانییە؟ ئێستا لێرەوە تەنیا بەشێکی ڕوخساری دیارە کە کەم تا کورتێك ڕوناکاییەکی پێوە دیارە. ئەگەر ڕووی بۆ لای ئێمە وەرگێڕا، ئەوسا لە تەوێڵی ورد بنەوە. ئەرێ بەڕاست تەوێڵی چۆنە بەلاتانەوە؟

دواتر ڕوو بە مێردەکەی بانگی کرد: دیمۆڤ، ئێمە خەریکین لەبارەی تۆوە دەدوێین ... وەرە ئێرە. ئەو دەستە شەریفانەت بدەرە ڕیابۆڤسکی ... ئەها! بەم شێوەیە! ... بۆ ئەوەی ببنە هاوڕێ.

دیمۆڤ، بە شەرم و بەوپەڕی پاکی و سادەییەکی نادیارەوە دەستی بۆ ڕیابۆڤسکی درێژ کرد و گووتی:

- زۆر خۆشحاڵم ... لە زانکۆ هاوپۆلێکم هەبوو بەنێوی ڕیابۆڤسکی، خۆ خزمەت نییە؟

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا تەمەنی سی ساڵ و دیمۆڤیش سیویەك ساڵ بوو. دوای چوونە نێو ژیانی هاوسەرییەوە، ژیانێکی خۆشیان هەبوو. ئۆلگا ئیڤانۆڤنانا نیگارەکانی خۆی و نیگارکێشەکانی تریشی - چ ئەوانەی لە چووارچێوە گیرابوون و و چ ئەوانەی بێ چووارچێوە بوون - بە دیوارەکانی ژووری میوانەوە هەڵواسی و مەودای نێوان پیانۆ و مۆبڵەکانیشی بە چەتری هەڵدراوی چینی و سێپایەی نیگارکێشان و پارچەی ڕەنگاوڕەنگی کۆنە و جۆرەها خەنجەر و چەند پەیکەرێکی نیوەجەستەی بچووك و وێنەی جۆراوجۆر، پڕ کردەوە ... تابلۆیەلی لە ڕیشاڵی توێکڵی درەخت دروستکراوی بە دیوارەکانی ئاشپەزخانەکەوە هەڵواسی و پێڵاوی لەچەرم و بەن دروستکراو و داسی پێوە کردن و لە گۆشەیەکی تریشدا داسێکی دەسك درێژ و شەنەکێشێکی دانا، بەم شێوەیە ڕازاندنەوەی چێشتخانەکە بە شێوازێکی ڕوسییانە، کۆتایی پێهات.

بۆ ئەوەی ژوری نووستنیشیان لە ئەشکەوت بچێ، پارچە قوماشی ڕەنگ تاریکی بە ساپیتە و دیوارەکانەوە داکوتا. فانۆسی ڤینیسییشی بە سەروی چارپای خەوەکانەوە هەڵواسی و پەیکەرێکیشی - کە تەورێکی دەسك درێژی بە دەستەوە بوو - لە بەردەرگای ژورەکە دانا. هەموان هاوڕا و دڵنیا بوون لەوەی کە ئەم دوو هاوسەرە گەنجە گۆشەیەکی ئارام و بێ دەنگ و خۆشیان بۆ خۆیان پێکەوەناوە.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا هەموو ڕۆژێ دەمژمێر یانزە لە خەو هەڵدەستا و ماوەی دەمژمێرێك پیانۆی لێ دەدا و ئەگەر کەشوهەوا خۆرەتاو با، بە ڕەنگی ڕۆنیی خۆی بە نیگارکێشانەوە سەرگەرم دەکرد. دواتر لای دەمژمێر یەکی دوانیوەڕۆ دەچووە لای بەرگدورەکەی. لەبەرئەوەی باردۆخی ژیانیان باش نەبوو وەك پێویست نەیدەتوانی بە جلوبەرگی نوێوە لە میوانی و کۆڕ و گردبوونەوەکان دا خۆی نیشان بدا و هەموان سەراسیمە بکا. بۆیە لەگەڵ بەرگدورەکەیدا



ناچاربوون فڕوفێڵ بخەنەکار: زۆرجار بەرگدورەکەی لە کراسی کۆن و چەندین جار ڕەنگکراو و پارچەی بێ کەڵك و مەخمەلی ڕیشودار و قردێلە و ئاوریشم ، جل و بەرگی زۆر شاز و جوان و دڵڕفێن و ئەفسانەیی بۆ دەدرو. بە ڕەواڵی خۆی، زۆربەی جاران لەلای بەرگدورەکەیەوە دەچووە لای هونەرمەندێکی ئاشنا تا لە هەواڵە نوێیەکانی دونیای شانۆ ئاگادار بێت و جگە لەوەش بۆئەوەی بتوانێ لە یەکەمین شەوی دەسپێکردنی نمایشی شانۆیەکی نوێ یان شانۆیەك کە لە بەرژەوەندی هونەرمەندێك نمایش دەکرا، بلیتێك بۆخۆی دەستەبەر کات. لەبەرئەوە دەبا سەری لە نیگارکێشێك یان چەندین هۆڵی نمایش دابا و دواتر دەچووە لای یەکێك لە کەسە ناودار و ناسراوەکان تا دیداری لەگەڵدا تازە کاتەوە یان بۆ خواردنی نانی ئێوارێ بانگێشتی بکا، یان هەندێك لە گەڵیدا بدوێ. لە هەموو شوێنێ بە گەرمی و ڕووخۆشییەوە پێشوازیان لێ دەکرد و هەمووان دڵنیایان دەکردەوە کە ژنێکی لەبەردڵان و دڵڕفێن و کەموێنەیە ... ئەوانەی کە بە بۆچوونی خۆی لە زومرەی کەسانی ناسراو و بەناوبانگ دەهاتنە ئەژمار، وەك کەسێکی خۆمانە، یان وەك هاوتایەکی خۆیان پێشوازییان لێ دەکرد. ئەوان بە سەرنجدان لەو توانایەی کە لەودا درکیان پێ کردبوو، تێکڕا لەسەر ئەوە کۆك و هاوڕا بوون ئەگەر بێت و زۆر ڕاڕا نەبێ و زۆر ئەمبەرەوبەر نەکا ئەوا بێ شك پاشەڕۆژێکی باشی لێ چاوەڕوان دەکرێ.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا گۆرانی دەگوت، پیانۆی لێ دەدا، نیگاری دەکێشان و پەیکەری دروست دەکرد، بەشداریی لە هێندێك شانۆی ناپیشەیی دا دەکرد و ئەم کارانەشی بە شێوەیەکی هاکەزایی ئەنجام نەدەدا، بەڵکو بەوپەڕی شەوق و ئارەزووەوە ئەنجامی دەدان. دەستی بۆ هەر کارێك بردبا - بۆ نموونە ئەگەر چرایەکی بۆ یەکێك لە شەوە چراخانییەکان دروست کردبا، یان جلوبەرگی بەجۆرێك پۆشیبا، یان خۆی ڕازاندباوە و ئارایشی کردبا، یان کراواتی کەسێکی

بەستبا، ئەوا ئەنجامی کارەکەی شتێکی زۆر هونەرمەندانە و لێزانانە و جوان دەردەچوو. بەڵام توانا و لێهاتووییەکانی وی لە زوو بنیادنانی بناغەی ئاشنایەتی لەگەڵ کەسانی ناودار و بەناوبانگ، لە هەموو بووارەکانی تر بەرچاوتر بوو. هەر هێندەی کەسێك ناوبانگێکی پەیدا کردبا و ناوی کەوتبا سەرزاران، ئیدی ئەم بێ دواکەوتن لەگەڵیدا دەبووە ئاشنا و لە چەند ڕۆژێك زیاتری نەدەخایاند ئەو ئاشنایەتییەی دەگۆڕی بۆ هاوڕێیەتی و هەر لەو دیدارەشدا بانگێشتی دەکرد بۆ ماڵەوە. هەموو بنیاتنانی ئاشنایەتیەکی تازە لە ڕووانگەی ویەوە وەك جەژنێکی ڕاستەقینە بوو. ئۆلگا کەسانی ناوداری دەپەرست، شانازی پێوە دەکردن و شەوانە خەونی پێوە دەبینین. تینوی ئاشنایەتی بوو لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە و هیچ کات نەیدەتوانی بەسەر ئەم حەز و خواستەی خۆی دا زاڵ بێت. کەسە بەناوبانگ و ناودارە کۆنەکان دەڕۆیشتن و بە فەرامۆشی دەسپێردران و کەسانی بەناوبانگی تازەتر جێگای ئەوانیان دەگرتەوە. بەڵام هێندەی نەدەخایاند لەگەڵ ئەوانیشدا ڕادەهات، یان لێیان بێزار دەبوو و بە پێداگری و سوربوونەوە هەوڵی ناسینی کەسانی ناودار و بەناوبانگی تری دەدا - کەسانی ناوداری تازەی دەدیتنەوە و پاشان دیسانەوە گەڕان و هەوڵی ناسینی کەسانی ناوداری تر، دەستی پێ دەکردەوە. بۆچی؟

نزیکەی دەمژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ دەگەڕایەوە ماڵ و لەگەڵ مێردەکەی دا نانی نیوەڕۆی دەخوارد. سادەیی و لۆژیکی ساخڵەم و دروست و کراوەیی دیمۆڤ، ئەوی شیفتە و بەکێش دەکرد، جارناجار بە پەلە هەڵدەستا و سەری دیمۆڤی لەنێو باسکەکانی خۆیدا دەگوشی و دەیدایە بەر ماچ و دەیگوت:

- دیمۆڤ تۆ مرۆڤێکی ژیر و شەریفی بەڵام خەوشێکی زۆر گەورەشت هەیە: هۆگرییت بۆ هیچ هونەرێك نییە، تۆ هەم موزیك ڕەت دەکەیتەوە و هەم نیگارکێشانیش.



مێردەکەشی بە ئاوازی دەنگێکی لەبارەوە وەڵامی دەدایەوە:

- ئازیزەکەم من نە هیچ لە موزیك دەزانم، نە لە نیگارکێشانیش. من تەواوی تەمەنم خستە خزمەت بوواری تەندروستیی و زانستە سروشتییەکانەوە و هیچ کات دەرفەتی ئەوەم بۆ نەڕەخساوە بتوانم کاتی خۆم بۆ هونەر تەرخان بکەم و شتێکی لێ بزانم.

- ئەمە شتێکی زۆر ترسناکە دیمۆڤ!

- بۆچی ترسناکە؟ خۆ ئاشناکانی تۆش هیچیان سەریان لە زانستی پزیشکیی دەرناچێ و هیچ زانیاریەکیشیان لەسەر زانستە سروشتیەکان نییە، کەچی سەرباری ئەمەش بەڕێزت هیچ کات ئەمەیان لێ بە عەیب ناگری. هەرکەسەو هۆگری شتێکی تایبەتە لە ژیاندا. من لەگەڵ ئەوەی کە هیچ سەر لە گۆرانی و ئاواز و ئۆپێرا و تابلۆی دورنما دەرناکەم بەڵام ئەمە تێڕوانینی منە: کاتێ بەشێك لە مرۆڤە ژیرەکان ژیانی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ هونەر و بەشێکی تریشیان پارەیەکی قەبە دەدەن و ئەو بەرهەمە هونەرییانە دەکڕن، کەواتە دەبێ مرۆڤ لێرەوە بگاتە ئەنجام و بزانێ کە هونەر شتێکی پێویستە. ڕاستە هیچ سەرم لە هونەر دەرناچێ و هیچ شارەزاییم لێی نییە، بەڵام ئەمە بەو واتایە نییە ڕەتی بکەمەوە و بە شتێکی بێ بایەخ و بێ نرخی بزانم.

- ڕێگام بدەرێ دەستە پیرۆزەکانت ماچ بکەم.

دوای ناخواردن، ئۆلگا ئیڤانۆڤنا دەچووە لای هاوڕێ و ئاشناکانی و دواتر دەچووە شانۆ یان کۆنسێرتێك و دواتر دوای نیوەشەوێ دەگەڕایەوە ماڵ. ئەمە بەرنامەی هەموو ڕۆژێکی بوو.

ئۆلگا شەوانی شەممان، هاوڕێ و ئاشناکانی بانگێشتی ماڵ دەکرد. لەو شەوانەدا ئۆلگا و میوانەکانی نە یاریی کاغەزیان دەکرد، نە سەمایان دەکرد بەڵکو هەموو کاتی خۆیان بە گفتوگۆی هونەریی و شێوازەکانی

نیگارکێشانەوە بەسەر دەبرد. ئەو هونەرمەندەی لە شانۆی دراماتیکدا کاری دەکرد بە دەنگ و ئەداوە دەکەوتە شیعر خوێندنەوە، گۆرانیبێژەکەی ئۆپێرا دەکەوتە گۆرانی گووتن، نیگارکێشەکان لە لاپەڕە جۆراوجۆرەکانی ئەلبوومەکەی ئۆلگا دا دەکەوتنە نیگارکێشان. کەمانچەژەن دەکەوتە کەمانچە ژەنین و خانمی خاوەنماڵیش هەم نیگاری دەکێشا و هەم پەیکەرسازیی دەکرد، هەم گۆرانی دەگووت، هەم بە پیانۆکەی لەگەڵ ڕیتمی ئاوازی کەمانچەکەی کابرای کەمانچەژندا هەنگاوی دەنا.

لە ماوەی پشوی نێوان خوێندنەوەی شیعر و ژەنینی موزیك و گۆرانیی گوتندا، دەکەوتنە گفتوگۆ لەبارەی ئەدەبیات و شانۆ و نیگارکێشانەوە. شەوانی شەممان هیچ ژنێك بانگێشت نەدەکرایە ماڵی ئۆلگا، چوونکە - جگە لە بەرگدورەکەیی و ژنە هونەرمەندەکانی هاوڕێی - هەموو ژنێکی تری بە شتێکی بێ نرخ و بێزارکەر دەزانی. ئەو شەوانەی کە هاوڕێ و ئاشناکانی بانگێشت کردبا، هەرکە دەنگی زەنگی دەرگا دەهات ڕادەچڵەکی و بە دەنگێکی سەرکەوتووانەوە دەیگووت: (( خۆیەتی )). ئەڵبەتە مەبەستی یەکێك لە ئاشنا بەناوبانگە نوێیەکانی بوو کە تازە دیتبوویەوە و بانگێشتی ماڵێی کردبوو. دیمۆڤ نەدەچووە ژوری میوان، کەسیشیان هەستیان بە بوون و نەبوونی وی نەدەکرد لەو ماڵەدا. بەلاّم دروست لە دەمژمێر یانزە و نیو بە زەردەخەنە جوان و میهرەبانەکەیەوە لەبەر دەرگای ژورەکەدا - کە بەسەر ژوری نانخواردندا دەکرایەوە - دەردەکەوت و لە حاڵێکدا کە دەستەکانی لە یەکتر دەسویی، دەیگوت:

- بەڕێزان نان ئامادەیە، فەرمون وەرنە سەر مێزەکە.

هەمویان دەچوونە ژوری نانخواردن و لە دەوری مێزێك - کە خواردنەکانی سەری هەرگیز گۆڕانکارییان بەسەردا نەدەهات - دادەنیشتن : بەربەلەمێك سەدەفی



دەریا، پارچەیەك ژامبۆن یان گۆشتی گۆلك، بڕێك ماسی ساردین و پەنیر و خاویار و خارچك و ڤۆدکا و دو سوراحی شەراب. ئۆلگا بەگەرمی و خۆشحاڵیەوە دەستەکانی لێکدی دەسویی و دەیگووت:

سەرخزمەتکارە خۆشەویستەکەی خۆم! تۆ شتێکی زۆر جیاوازی! بەڕێزان سەیری تەوێڵی بکەن! دیمۆڤ! تۆزێ ڕوت وەرگێڕە. ئێستا لێی وردبنەوە! سەیری قەلاّفەتی بکەن! دەڵێی بەوری بەنگالە بەلاّم ڕوخساری میهرەبان و خۆشەویستانەی، بە موو لە ڕوخساری ئاسك لای نەداوە. ئاه، خۆشەویستەکەی خۆم.

میوانەکان سەرگەرمی نانخواردن بوون بەدەم نانخواردنیشەوە لەویان دەڕوانی و بیریان دەکردەوە: ((چەندە گەنجێکی باشە!)) بەلاّم هەر زوو بیریان دەچۆوە کە هەر لەوێشە و دیسانەوە دەکەوتنەوە سەر باسی شانۆ و موزیك و نیگارکێشانی خۆیان.

ژن و مێردی لاو خۆشبەخت بوون و ڕۆژگاریان بە خۆشی و شادی بەڕێ دەکرد. ئەڵبەتە سێیەمین هەفتەی مانگی هەنگوینییان نەك تەنیا بەخۆشی بەڕێ نەکرد بەڵکو بە خەم و خەفەتەوە بەسەریان برد چوونکە دیمۆڤ نەخۆشی ئاگرەی لە نەخۆشەکانەوە گرتەوە و شەش ڕۆژی تەواو خەوێنرا. جگە لەوەش ناچار بوو قژە جوانەکەی لەبنەوە بتاشێ. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا بەتەنیشتی چارپاکەیەوە دادەنیشت و بە حەسرەتەوە فرمێسکی دەڕشتن، بەلاّم هەرکە دیمۆڤ بڕێك تەندروستی باشتر بوو دەسرۆکەیەکی بە سەرە تاشراوەکەیەوە بەست و وێنەی مێردەکەی بەو دیمەنەوە - کە دەتگوت بوودایە - کێشا. ئەم سەرگەرمیە هەردوکیانی خۆشحاڵ کرد.

دیمۆڤ، سێ ڕۆژ دوای چاکبوونەوە واتا ئەو ڕۆژەی کە دوبارە چووەوە سەر کارەکەی، توشی بەدبەختیەکی تر هات. ئەو ڕۆژە دوای نانخواردن ڕووی کردە

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا و گووتی: بەردەوام چانسم نایهێنێ! ئەمڕۆ چووار تەرمان لابوو بۆ توێکاریی و بەو هۆیەوە دوو پەنجەی خۆمم بڕی. دوای گەڕانەوە ئەمجار هەستم پێ کرد.
ئۆلگا ئیڤانۆڤنا ترسا، بەلاّم ئەو، بە زەردەخەنەوە گووتی ئەو برینە هێندە گرینگ نییە بەلایەوە و ڕوداوی لەم چەشنە شتێکی چاوەڕوانکراو و ئاساییە لەم جۆرە کارانەدا و درێژەی دایە:
- ئەو کاتانەی کارمان زۆرە، بیر و هزری خۆمم بۆ کۆ ناکرێتەوە و خەیالّم دەڕوا.
ئۆلگا ئیڤانۆڤنا نیگەران و پەرێشان، ترسی ئەوەی هەبوو برینەکەی تەشەنە بکا. شەوانە نزای دەکرد و لەدەرگای خودا دەپاڕایەوە، بەلاّم باش بوو بەخێر کۆتایی پێ هات و هەردوکیان دەستیان بە ژیانی ئارام و ئاسودەی خۆیان کردەوە. سەردەمیش جوان و باش بوو و بەهاریش - ئەو بەهارەی کە خەریك بوو لەدورەوە بزەی دەهاتێ و مژدەی هەزاران خۆشی و جوانیی دەدا - خەریکبوو دەبووە پاشای سەردەم. وایان هەست دەکرد کە خۆشبەختیی هەرگیز کۆتایی نایەت! ئەو بەرنامەی کە بۆ ژیانی خۆیان دایان ڕشتبوو بەم شێوەیە بوو: لە مانگەکانی نیسان و ئایار و حوزەیراندا دەچن لە خانویەکی هاویەنەواریی و لە شوێنێکی دوور لە شار دەبەنەسەر، کاتەکانیان بە پیاسە و نیگارکێشان و ڕاوەماسی و گوێگرتن لە چریکەی بوولبوولان بەسەردەبەن ...
دواتر ئۆلگاش کاتەکانی خۆی لە تەموزەوە تا کۆتایی هاوین لەگەشتێکی بەکۆمەلّ و لەگەلّ هاوەلّە نیگارکێشەکانیدا - وەك ئەندامێکی هەمیشەیی - بەسەر ڕوباری ڤۆلگاوە دەباتە سەر. وە هەر لە ئێستاوە دوو دەست جلوبەرگی کرباسی و هەندێك بۆیە و فلچە و خام و تەختەی نوێی ئامادە کردبوو بۆ ئەو گەشتە. ڕیابۆڤسکی تەقریبەن هەموو ڕۆژێ دەهاتە سەردانی تا لە



پێشڤەچوونەکانی وی لە بوواری هونەری نیگارکێشاندا ئاگادار بێت. هەموجارێ کە ئۆلگا سکێچەکانی خۆی پێ نیشان دەدا، دەستەکانی دەخستنە قولاّیی گیرفانەکانی و لێوەکانی خۆی دەگەست و بە فسەفسێکەوە دەیگوت:
- باشە ... ئەو هەورەی کێشاوتە گریانی پێوە دیارە: ڕوناکیەکەی، ڕوناکیی سەروەختی خۆرئاوابوون نییە. دیمەنە سروشتییە نزیکەکانت زیاد بەسەر یەکدا هەلّشێلاوە واتا ئەوە نییە کە دەبێ هەبێ ... کوختەکەش هەمانشێوەیە ... خۆی گرمۆلّە کردووە و مرۆڤ بەزەیی پێدا دێتەوە ... دەبێ ئەو گۆشەیە برێك تاریکتر بکەیت. بەلاّم بەگشتیی خراپ نییە ... دەستت خۆش بێ.
چەند ڕیابۆڤسکی تەمومژاویتر و ناڕوونتر قسەی کردبا، ئۆلگا ئیڤانۆڤنا ساناتر لە وتەکانی تێ دەگەیشت.

3

دیمۆڤ، سەرلەبەیانی (ڕۆژی ترۆییتسێن*)، واتا پەنجایەمین ڕۆژی جەژنی پاك، نانی نیوەڕۆی خوارد و هەندێك شیرنیی و کەلوپەلی خواردەمەنیی کڕی و بۆ بینینی ئۆلگا بەرەو هاوینەوارەکە کەوتەڕێ. دوو هەفتە بوو ئۆلگای نەبینیبوو، زۆر هەستی بە نیگەرانیی دەکرد. ئەو کاتەی کە لە فارگۆنەکەدا دانیشتبوو بەنێو دارستانەکەدا چاوی بۆ ڤێلاکەی خۆیان - کە بەکرێیان گرتبوو - دەگێڕا، هەستی بە ماندویی و برسێتی دەکرد و هیچ ئارەزویەکی لە دلّدا نەبوو جگە لەوەی پێکەوە لەگەلّ ئۆلگا لە هەوایەکی ئازاددا نانی ئێوارێ بخۆن و دواتر لێی پالّداتەوە و بنوێ. زەرفەکەی دەستی هەندێك خاویار و پەنیر و ماسی تێدابوو و تا دەکەوتنەوە بەرچاوی خۆشحالّی دایدەگرت.
سەرەنجام دەمەدەمی خۆراوا، ڤێلاکەی دۆزیەوە. خزمەتکارە پیرەکەیان هەوالّی دایە کە خانم لە مالّێ نییە و لەوانەیە هاکا بگەڕێتەوە. ئەم بینا نالەبارە بە

زەویی دارینیی کون کون و پڕ لە چاڵ و ساپیتەی نزمە و بە کاغەز داپۆشراوەکەیەوە، تەنیا سێ دانە ژووری تێدابوون. لە ژووری یەکەمدا، جگە لە چارپایەکی نووستن، هیچی تری تێدا نەبوو، لەژوورەکەی تردا سەر کورسی و پەنجەرەکان - هەموو شوێنێك - پڕ بوو لە پارچە قوماشی خام و فلچە و کاغەزی بەکارهاتوو و باڵتۆ و کڵاوی پیاوانە. لە ژوورەکەی تریشدا سێ پیاوی نامۆی - یەکیان قەڵەو و ڕیش تاشراو بوو و پێدەچووو ئەکتەری شانۆ بێ و دوانەکەی تریش - گەنمڕەنگ و ڕیش کورت بوون - بینی. کابرای ئەکتەر، بەنیگایەکی گرژەوە سەرتاپای جستەی دیمۆڤی بەچاو هەڵسەنگاند و بە تۆنیکی گڕەوە گووتی:

- کارت بە کێیە؟ دەتەوێ ئۆلگا ئیڤانۆڤنا ببینی؟ کەمێك چاوەڕوانبە ئێستا دەگەڕێتەوە.

دیمۆڤ دانیشت و چاوەڕوانی گەڕانەوەی ژنەکەی بوو. یەکێك لە پیاوە گەنمڕەنگەکان بە جوڵەیەکی سارد و خەواڵووانەوە چای بۆ خۆی تێکرد و لە دیمۆڤی پرسی:

- چای ناخۆیەوە؟

گەرچی پێویستی بە خواردن و خواردنەوە بوو بەڵام پێشنیارەکەی کابرای ڕەت کردەوە، چوونکە نەیدەویست ئەو ئیشتیهایەی هەیبوو لەدەستی بدات.

هێندەی نەخایاند دەنگی پێ و پێکەنینێکی ئاشنا بیسترا. دەرگای ژوورەکە کرایەوە و داخرایەوە و ئۆلگا ئیڤانۆڤنا لە حاڵێکدا کە کڵاوێکی لێوار پان لە سەر و سندوقێکی بەدەستەوە بوو، وەژوورکەوت. ڕیابۆڤسکیش کە چەترێکی گەورەی بەدەستێك و کورسیەکی سەفەریی بەدەستەکەی ترەوە بوو، دوابەدوای وی خۆی بە ژووریدا کرد. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا هەرکە دیمۆڤی بینی لەخۆشیان سوور هەڵگەڕا و هاواری کرد:



- دیمۆڤ!

دواتر سەر و هەردوو دەستی خۆی بە سینگی ویەوە نوساند و دوبارەی کردەوە:

- دیمۆڤ! سەرەنجام هاتی! تا ئێستا لەکوێ بووی؟ بۆ نەدەهاتی؟ بۆچی؟ ها! بۆچی؟

- پێتوایە هێندە کاتم زۆرە؟ سەرقاڵم، ئەوکاتانەی دەرفەتێکیشم بۆ هەڵدەکەوێ کاتەکەی لەگەڵ کاتی دەرچوونی شەمەندەفەر یەکناگرێتەوە.

- نازانی چەندە خۆشحاڵم بە بینینت! دوێنێ شەوێ بەردەوام خەونم پێتەوە دەبینی، بەڕاستی باش و میهرەبانی! چەندە لە کاتێکی باشدا هاتیت! خۆشەویستم دەبێ ڕزگارم کەیت!

پاشان بەدەم پێکەنین و ڕێکخستنەوەی گرێی بۆیمباخی مێردەکەیەوە، درێژەیدایە:

- زەماوەندێکی بێ وێنەمان لەپێشە. گەنجێکی تەلەگرافچی وێستگەی ئاسن لێرەیە و ناوی ( چیکلدۆڤ ) ە سبەی ژن دێنێ. گەنجێکی جوانە و کەسێکی بێ ڕێزیش نییە و خۆت دەزانی، شتێکی زۆر بەهێز هەیە لە قیافەیدا کە بەبینینی مرۆڤ یەکسەر ورچی بیردەکەوێتەوە ... خوا داویەتی بۆ مۆدێلی وایکینگێکی لاو. ئێمە، واتا سەرجەم هاوینەوارنشینانی ئێرە، بەڵێنمان داوەتێ بەشداریی زەماوەندەکەی بکەین. دەزانی، مرۆڤێکی تەنیا و تا ڕادەیەك بێ پارە و شەرمنیشە، ڕەتکردنەوەی داواکاریەکەی بەلامانەوە وەك تاوان بوو. بیهێنەرە بەرچاوی خۆت، دوای تەواوبوونی نوێژی بەیانی مەراسیمی مارەکردن کۆتایی پێ دێت و لەکلیساشەوە هەمومان بەکۆمەڵ، بەپێیان بەرەو ماڵی بووکێ وەڕێ دەکەوین ... دەزانی، جەنگەڵ و نەغمەی باڵندان و پەڵەی ڕوناکیی خۆرەتاو بسەر سەوازاییی و ئێمەوە، بە شکڵی پەڵەی ڕەنگاوڕەنگ بسەر سەوزاییی دا

دەدرەوشێتەوە ... باوەڕکە مرۆڤ نویێ دەکاتەوە و شتێکی بێ وێنەیە - چەشنی شێوازی ئامپرسیۆنیستەکانی فەڕەنسا.
دواتر قیافەیەکی گریاناوی بەخۆوە گرت و دیسانەوە تێهەڵچۆوە:
- بەڵام نازانم چ لەبەرکەم بۆ کلیسا؟ هیچم لەگەڵ خۆمدا نەهێناوە، نە کراسم لایە، نە گوڵی بەر بەرۆك، نە دەسکێش ... دیمۆڤ دەبێ فریامکەوی، دەبێ ڕزگارمکەی. هاتنی ئەمڕۆت بۆ ئێرە بەو واتایەیە کە چارەنوست وابووە بێیتە ئێرە و ڕزگارمکەیت. خۆشەویستم کلیلەکان هەڵگرە و بگەڕێرەوە شار و کراسە ڕەنگ گۆشتییەکەم لەنێو کۆمەدیەکەم دایە دەریبێنە و وەرەوە. دەزانی کام کراسەیان دەڵێم؟ ئەوەی کە لەنێو کۆمەدیەکە لە ڕیزی پێشەوە هەڵمواسیوە ... پاشان کە چوویتە مەخزەنەکە، هەرلەویێ لەلای ڕاست لەسەر زەویەکە دو دانە قتوی لێن ... هەرکە قتوەکەی سەرەوەت کردەوە پڕە لە پارچەی تۆڕی و جۆراوجۆر، لەژێریاندا، چەند دانە گوڵی دەسکردم هەن - خۆشەویستم ئاگاداربە بە وریاییەوە هەڵیانگرە با نەنوشتێنەوە و تێك نەچن - هەمویانم بۆ بێنە خۆم لێرە یەکێکیان هەڵدەبژێرم ... لەسەر ڕێگای خۆشت جوتێك دەسکێشم بۆ بکڕە.
- زۆر باشە، سبەی ئەگەر چوومەوە شار هەمویانت بۆ دەنێرم.
ئۆلگا ئیڤانۆڤنا بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی کرد و پرسی:
- سبەی؟ جا کوا سبەی دەرفەتی ئەوەت هەیە؟ یەکەم شەمەندەفەر سبەی دەمژمێر نۆ دەکەوێتەڕێ، مەراسیمی مارەکردنەکەش دەمژمێر یانزەیە. نا خۆشەویستم، نابێ، دەبێ هەرئەمڕۆ ئەو کارەم بۆ بکەیت، هەرئەمڕۆ! ئەگەر خۆشت نەتتوانی بە بە پەیکێکدا بینێرە. باشە ئازیزم! کەوابێ ئێستا وەڕێکەوە ... هاکا شەمەندەفەر گەیشت. دوانەکەویت خۆشەویستم.
- زۆرباشە.



- ئاه، زۆر بەداخەوەم کە لە خۆمت دوور دەخەمەوە و دەتنێرمەوە شار! ئەمەی گووت و لەکاتێکدا کە دلۆپە فرمێسك بە چاوانییەوە دەدرەوشانەوە درێژەی پێدا:
- تاوانی گەمژەیی منە کە بەڵێنم بەو تەلەگرافچیە دا بەشداری زەماوەندەکەی بکەم!
دیمۆڤ، بەپەلە فنجانە چایەکی خواردەوە و نانێکی هەڵگرت و بە زەردەخەنەیەکی شەرمنانەوە بەرەو وێستگەی ڕێگای ئاسن کەوتەڕێ. ئەو خاویار و پەنیر و ماسیەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی بوون بە نسیبی کابرای ئەکتەر و دو پیاوە گەنمڕەنگەکە.

4

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا لە شەوێکی ئارام و مانگەشەوی مانگی حوزەیران دا، بەسەر پشتی کەشتییەوە ڕاوەستابوو. جارجار لە ئاوی ڕوباری ڤۆڵگای دەڕوانی و جارجاریش لەکەنارە جوانەکانی وردەبۆوە. ڕیابۆڤسکیش لە تەنیشتیەوە ڕاوەستابوو و دەیگوت ئەو سێبەرە ڕەشانەی بەسەر ئاوەکەوەن خەونن نەك سێبەر و کاتێ سەرنج دەدەیتە ئەم ئاوە تەلیسماوییە و ئەو درەوشانەوە لە ئەندازەبەدەر جوانەی و هەروەها کاتێ سەرنج دەدەیتە ئاسمانی قوڵ و بێ کۆتایی و ئەو کەنارە کشومات و خەمگینەی - کە دەڵێی لەبارەی گرفتاریەکانی ژیانی مرۆڤ و بەختی باش و خوداوەند و ئەبەدیەتەوە دەدوێن - چەند شتێکی باشە مرۆڤ خۆی بە فەرامۆشی بسپێرێ و بمرێ و ببێتە یادەوەریەك. دەیگووت کە ڕابردوو ڕۆیشت و تێپەڕی و ئیدی سەرنجی هیچ کەس بەلای خۆی دا ڕاناکێشێ و ئایندەش شتێکی پوچ و بێ واتایە و ئەم تاقە شەوە جوانەی ژیانیشیان

بەخێرایی تێدەپەڕێ و کۆتایی دێت و دەبێتە بەشێك لە ئەبەدیەت، کەوابێ بۆچی دەبێ بژی؟

بەڵام ئۆلگا ئیڤانۆڤنا - کە جارجار گوێی لە ڕیابۆڤسکی دەگرت و جارجاریش لە بێدەنگی شەو - وایدەزانی بوونەوەرێکی نەمرە و هەرگیز نامرێت. ڕەنگی فیرۆزەیی ئاوەکە و - کە پێشتر شتی لەو شێوەیەی هەرگیز نەبینیبوو - ئاسمان و کەنارەکان و سێبەرە ڕەشەکان و ئەو گوڕوتینە نائیرادی و بێ کۆتاییەی هەمو گیانی گرتبۆوە، مژدەی ئەوەیان دەدایە لە ئایندەدا دەبێتە نیگارکێشێکی بەناوبانگ و سەرکەوتن و ناوبانگ و شانازیی و خۆشویستنی جەماوەر، لەشوێنێکی دوورەدەست، لە پشت شەوە تریفەدارەکان و ئاسمانی بێ کۆتاییەوە، چاوەڕوانی ئەون ... ئەو کاتەی کە بێ چاوتروکان چاوی بڕیبووە شوێنە دورەدەستەکان، بە عەزییەیەکی سپییەوە خۆی لەنێو ئاپۆرەی جەماوەر و مەراسیمی  چراخان و ئاگربازیی و نەوای موزیك و هاتوهاوار و گوڵبارانی جەماوەردا هێنایە بەرچاو. لەو کاتەدا وا هەستی کرد کە مرۆڤێکی گەورە، بلیمەتێکی ڕاستەقینە، پیاوێك کە هەڵبژێردراوی خودایە، بەتەنیشتیەوە ڕاوەستاوە و ئانیشکی داداوەتە سەرپەرژینی ئاسنینی کەشتیەکە ... وە هەر ئەو کارانەی کە تا ئێستا لەلایەن ئەم بلیمەتەوە ئافرێنراون، هونەرێکی باڵا و نوێ و شتێکی کەم وێنەن، بەڵام لە ئایندەدا، ئەو دەمەی حەزی داهێنانی وی پاڵپشتێکی بەپشتەوە بێت، بەرهەمی سەرسوڕهێنەر دەئافرێنێ و هەموو ئەمانەشی بە ڕوخسار و شێوازی دەربڕین و وابەستە بوونی بە سروشتەوە، دیارە . ئەم پیاوە زیرەکە لە سێبەرەکان و ڕەنگەکانی دەمی خۆرئاوابوون و تریفەی مانگەشەو و بە شێوەیەکی تایبەت و بە زمانێکی جیاواز و تایبەت بەخۆی دەدوێ، بەشێوەیەك کە تواناکانی بەسەر سروشتەوە بێ ئیختیار هەست پێ



دەکرێن.  ئەو پیاوێکی نوێخواز و جوان و لەبارە، ژیانە ئازاد و سەربەخۆ و خاڵی لە گرفتاریەکانی، مرۆڤ دەخاتەوە یادی مەل و باڵندان.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا لەرزێکی بە جەستەدا هات و گووتی:

- هەوا خەریکە فێنك دەبێ.

ڕیابۆڤسکی بارانییەکەی خۆی بە سەر شانەکانی ئەودا دا و بە تۆنێکی تێکەڵ بە حوزنەوە گووتی:

- هەستەکانم پێم دەڵێن لە بەندی هێزی تۆدام . هەست دەکەم لە کۆیلەیەك زیاتر نیم. هۆی چیە ئەمڕۆ هێندە جوان و دڵڕفێنی؟

بێ ئەوەی نیگای لەسەر بگوازێتەوە لە چاوەکانی وردبۆوە. نیگای هێندە ترسێنەر بوو، کە ژنەی گەنج دەترسا سەیری بکا. ڕیابۆڤسکی کە بە هەناسەی گەرمی خۆی ڕومەتی ئۆلگا ئیڤانۆڤنای نەوازش دەکرد، بەسرتە گووتی:

- شێتانە خۆشمدەوێی ...

دوای بێدەنگیەکی کورت، بەجۆش و خرۆشێکی زیاترەوە درێژەیدایە:

- ئامادەم بە یەك ئاماژەی تۆ کۆتایی بە ژیانی خۆم بێنم، ئامادەم واز لە هونەر بێنم ... دە خۆشتبووێم ...

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا چاوەکانی داخست و وەڵامی دایەوە:

- ئەم قسانە مەکە، ترسناکە! ئەدی دیمۆڤ؟

- دیمۆڤ؟ دیمۆڤی چی؟ من چ کارم بە دیمۆڤە؟ لێرە هیچ هەواڵێك لە دیمۆڤ نییە، ئەوەی هەیە ڤۆڵگایە و مانگەشەوە و جوانییە و عیشقی من و  جۆش و خرۆشی منە ... ئاه، سەر لەمانە دەرناکەم ... من هیچ پێویستییم بە ڕابردوو نییە، تەنیا ... تەنیا ساتێکم لەتۆ دەوێ ... تەنیا ساتێك!

دڵی ئۆلگا ئیڤانۆڤنا شێتانە لێی دەدا. دڵی دەیویست جگە لە مێردەکەی خۆی، بیر لە هیچ شتێکی تر نەکاتەوە، بەڵام لە ڕوانگەی ویەوە سەرتاپای ژیانی

ڕابردووی - لە زەماوەندی بووکێنییەوە بگرە تا دیمۆڤ و بانگێشت کردنەکانی شەوانی شەممەی - شتێکی سواو و پوچ و بێ ڕەنگ و بێ هودە و زۆۆۆر دوور خۆی دەنواند ... ڕاستیەکەی: دیمۆڤی چی؟ چ کاری بە دیمۆڤە؟ مەگەر کەسێك هەیە بەنێوی دیمۆڤ؟ دەبێ دیمۆڤ لە خەو و خەونێك زیاتر چی تر بێت؟

پاشان لەحاڵێکدا کە ڕوخساری خۆی بە ناولەپی دەستی دادەپۆشی، کەوتە بیرکردنەوە: (( ئەو خۆشبەختیی و ئاسودەییەی تا ئێستا بەو کابرا سادە و ئاساییەم بەخشیوە، لەسەروپێیانی زیادە. لێگەڕێ با هەر سەرزەنشتم بکەن، با تا دەتوانن بەنەفرەتم کەن، ئەگەر لەداخی ئەوانیش بووە خۆم لەنێودەبەم. مرۆڤ تا ژیانی ماوە دەبێ هەموو شتێك تاقی بکاتەوە. ئای خودایە چەندە ترسناك و لە هەمان کاتدا چەندە دڵگیرە!)).

بەڵام ڕیابۆڤسکی لەحاڵێکدا کە ئۆلگای لە ئامێز دەگرت و دەستەکانی ئۆلگای - کە بەنەرمی هەوڵیان دەدا ئەم پیاوە دوور بخەنەوە - ماچ دەکرد، لەژێرلێوەوە و بە چرپە دەیگووت:

- باش؟ چی بوو؟ خۆشتدەوێم؟ ها؟ دە پێمبڵێ؟ ئای چ شەوێکە! چەندە شەوێکی جوانە!

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا نیگایەکی چاوەکانی وی - کە فرمێسك تێیاندا بریسکەی دەدایەوە - کرد و لە ژێر لێوەوە گووتی: بەڵێ، شەوێکی جوانە!

دواتر بەخێرایی سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و ڕیابۆڤسکی لە ئامێز گرت و بەتاسەوە لێوەکانی مژی. لەم ساتەدا لەوسەری پشتی کەشتیەکەوە دەنگێك بیسترا کە دەیگووت:

- خەریکە دەگەینە کینشیما!



خزمەتکاری بووفەی کەشتیەکە بە هەنگاوە قورسەکانییەوە بەتەنیشتیاندا تێپەڕی. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا کە لە خۆشییان پێکەنین و گریانی تێکەڵ ببوو، بە خزمەتکارەکەی گووت:

- گوێبگرە! شەرابمان بۆ بێنە!

ڕیابۆڤسکی، لەتاوان ڕەنگی لێ بڕابوو، لەسەر نیمکێتەکە دانیشت و نیگایەکی لێوانلێو لە سوپاس و پەرستنی گرتە ژنەی گەنج. دواتر چاوەکانی داخست و زەردەخەنەیەکی ساردی کرد و گووتی:

- ماندووم.

پاشان سەری خستە سەر پەرژینە ئاسنینەکە.

5

دوی ئەیلول ڕۆژێکی گەرم و ئارام و لەهەمان کاتدا ئاسمان هەوراویی بوو و لە بەرەبەیانیشەوە تەمومژێکی کەم ڕوباری ڤۆلگای داپۆشیبوو. لە دەمژمێر نۆی بەیانییەوە باران دەستی بە بارین کرد، چاوەڕوان نەدەکرا هەورەکان بەری ئاسمان بەربدەن. ڕیابۆڤسکی لە کاتی خواردنی نانی بەیانیدا بە ئۆلگا ئیڤانۆڤنای گووت کە نیگارکێشان پەژاراویترین و بێ سودترین هونەرە و خۆشی شتێکی ئەوتۆ لە بارەی ئەم هونەرەوە نازانێ، ئەوە مرۆڤە گەمژەکانن کە ئەو بە کەسێکی خاوەن توانا و لێهاتو دەزانن. پاشان بێ پێشەکی چەقۆیەکی هەڵگرت و چووە سەر یەکێك لە باشترین بەرهەمەکانی خۆی و لەچەند جێگاوە خەت خەتی کرد و ڕووشاندی، دوای خواردنی نانی بەیانیش بەگرژیی و پەستیەوە لەبەردەم پەنجەرەکە دانیشت و چاوی بڕیە ڕوباری ڤۆڵگا. بەڵام ئیدی ڤۆڵگا ئەو درەوشانەوە جوانەی ڕۆژانی پێشووی نەبوو - لێڵ بوو، دیمەنێکی ساردوسڕی هەبوو. هەموو شتەکان هەواڵی نزیکبوونەوەی وەرزی پایزی گرژ و پەژاراوییان

دەدا. دەتگووت سروشت، فەرشی سەوز و ڕازاوەی کەنارەکان و تیشکدانەوەی ئەڵماس ئاسای ڕۆشناییەکان و دیمەنی ڕوون و مەیلەوشینی بێ کۆتایی و سەرجەم شتە جوان و دڵبزوێنەکانی لەبەر ڤۆڵگا دارنیوە و تا بەهاری داهاتوو لە سندوقێکدا شاردونییەوە، قەلەڕەشەکان بەسەر ئاسمانی ڕوبارەکەوە لە فڕیندا بوون. دەتگوت بەدەم فڕینەوە لچ لە ڤۆڵگا هەڵدەقورتێنن و دەڵێن: ((ڤۆڵگای ڕوتوقوت! ڤۆڵگای ڕوتوقوت! )). ڕیابۆڤسکی گوێی بۆ قارەقاڕی قەلەڕەشەکان هەڵخستبوو و بیری دەکردەوە کە توانا و بەهرەی خۆی لەدەست داوە و ئەوەی کە هەیە لەم دونیایەدا شتێکی گرێبەستیی و ڕێژەیی و گەمژانەیە، و نەدەبووایا پەیوەندیەکی لەوشێوەیەی لەگەڵ ئۆلگادا دروست کردبا ... وە بە کورتی هۆشی لەسەر خۆی نەبوو و هەستی بە نیگەرانی دەکرد.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا لەپشت ئەو دیوارەی کە ژوورەکەی دەکرد بە دوو بەشەوە لەسەر چارپاکە دانیشتبوو و لە حالێکدا کە یاریی بە قژە چەشنی ڕیشاڵی کەتانەکەی خۆی دەکرد، جارێك خۆی لە ژووری میوان و جارێك لە ژووری نووستن و جارێکی تر لە ژووری کاری مێردەکەی، دێنا بەرچاو، سواری سەرپشتی مەلی خەیاڵ ببوو و دەچووەوە شانۆ و دەچووەوە لای بەرگدورەکەی و دەچووەوە لای ئاشنا بەنێوبانگەکانی. ئەرێ دەبێ ئێستا ئاشنا و هاوڕێکانی سەرقاڵی چی بن؟ دەبێ بیر لەو بکەنەوە؟ ئێستا وەرزی نمایشی شانۆ دەستی پێکردووە و کاتی ئەوەیە بیر لە سازدانی میوانداریە شەوانەکانی بکاتەوە. ئەی دیمۆڤ؟ دیمۆڤی میهرەبان! لەنامەکانیدا بە چ خۆگری و گلەییەکی منداڵانەوە داوای گەڕانەوەی هەرچی زووتری لێ دەکرد بۆ ماڵێ! هەموو مانگێ بڕی حەفتاوپێنج ڕۆبڵی بۆ کڕینی پێداویستی بۆ دەنارد و جارێکیشیان لە نامەیەکیدا بۆ دیمۆڤ و بە مەبەستی دانەوەی ئەو سەد ڕۆبڵەی کە لە هاوڕێ نیگارکێشەکانی قەرزی کردبوو، داوای لێکرد سەد ڕۆبڵی بۆ بنێرێ، ئەویش سەد ڕۆبڵی بێ کەم و زیادی بۆ ناردبوو. چ



مرۆڤێکی بەرچاوتێر و بەهیمەتە! ئۆلگا ئیڤانۆڤنا وەڕەز ببوو لەم گەشتە و حەزی دەکرد هەرچی زووە خۆی لەو لادێییانەو لە بۆنساردی ئەو ڕووبارە دوورخاتەوە و خۆی لەو پیس و پەڵۆسیەی کە هەموو جاری بەهۆی گواستنەوەیانەوە لە لادێیەکەوە بۆ لادێیەکی تر و مانەوە لە کوختەخانوە دێهاتیەکان بە جەستەیەوە دەلکا، پاك کاتەوە. ئەمە لەکاتێکدا کە ڕیابۆڤسکی بەڵێنی شەرەفی بە نیگارکێشەکانی تر نەدابوو کە تا بیستی مانگی سێپتەمبەر لەگەڵیاندا بمێنێتەوە، ئەی خۆزگە هەرچی زووە دەگەڕانەوە! ڕیابۆڤسکی بە ئاهـ هەڵکێشانەوە گووتی: خودایە، دەبێ ئەم خۆرە کەی سەر دەربێنێ؟ لەم ڕۆژە هەوراویەدا ناتوانم دیمەنی ڕۆژێکی ساماڵ بنەخشێنم!

ئۆلگا لەو دیوی دیوارەکەوە وەڵامی دایەوە: بەڵام تۆ سکێچی ڕۆژێکی هەوراوییت هەیە ... بیرتە؟ لە لای ڕاست جەنگەڵێك و لە لای چەپ گاڕانێك و ڕەوە قازێك هەبوون ... بۆچی ئەوەیان تەواو ناکەی؟

نیگارکێش ڕوخساری گرژ کرد و گوتی: ئاهـ! تەواویکەم! ناکا هێندە بە گەمژەم بزانی و پێتوابێ ڕێ بە کاری خۆم نابەم!

ئۆلگاش ئاهێکی هەڵکێشا و گووتی:

- ڕەفتارت لەگەڵ مندا چەندە گۆڕاوە!

- چەندە باشتر!

ماسولکەکانی ڕوخساری ژنە لەرزین. بەرەو لای زۆپاکە ڕۆیشت و دایە پڕمەی گریان.

- بەس لە گریانمان کەم بوو! بەسە وازبێنە! گەرچی من هەزاران هۆکارم هەیە بۆ گریان، بەڵام سەرباری ئەوەش ناگریم.

ئۆلگا بەدەم پڕمەی گریانەوە گووتی:

- هەزاران هۆکار! بەڵام گەورەترینیان ئەوەیە کە لێم تێربوویت. بەڵێ.

پاشان بەگریانەوە درێژەی دایە: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە هەست بە شەرم دەکەیت لەم عیشقەمان! گەرچی ئەم پەیوەندیەی ئێمە لای هیچ کەس شاراوە نییە کەچی سەرباری ئەوەش هەوڵ دەدەی لە هەموو کەسێکی بشاریتەوە - تەنانەت لە نیگارکێشەکانی هاوگەشتیشمان کە ئاگاداری وردودرشتی هەموو شتێکن.

ڕیابۆڤسکی دەستی خستە سەر سینەی و بە دەنگێکی تکاکارانەوە گووتی:

- ئۆلگا، تکایەکم لێت هەیە، تەنیا تکایەك: خەفەتم مەدەرێ! جگە لەمە هیچ شتێکی ترم لێت ناوێ!

- کەوایە سوێندم بۆ بخۆ کە ئێستاش خۆشت دەوێم!

نیگارکێش لە حاڵێکدا کە بەپەلە هەڵدەستایە سەرپێ، گووتی:

- کارەساتە! ئەم باسە بەرەو ئەوە تەشەنە دەستێنێ خۆم هەڵدەمە ڤۆلگاوە یان بەرەو شێتبوونم ببا! بڕۆ وازم لێ بێنە!

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا قیژاندی: دەکەوایە وەرە بمکوژە! دەی بمکوژە!

پاشان بەدەم فرمێسك ڕشتن و ناڵەناڵەوە چووە ئەودیو دیواری ژورەکە. دەنگی بارینی باران بەسەر کوختە بە قامیش داپۆشراوەکەوە بیسترا. ڕیابۆڤسکی سەری خستە نێو دەستەکانی و بەنێو کوختەکەدا - لە گۆشەیەکەوە بۆ گۆشەیەکی تر - کەوتە هاتوچۆکردن. دواتر بە قیافەیەکی بڕیاردەرانەوە وەك ئەوەی بیەوێ شتێك بە کەسێك بسەلێنێ کلاوەکەی کردە سەری، تفەنگەکەی بە شانیدا دا و چووە دەرێ.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا، دوای چوونەدەرەوەی ڕیابۆڤسکی، ماوەیەك لەسەر چارپاکە ڕاکشا و فرمێسکی ڕشتن. بەرلەوەی بتوانێ بیربکاتەوە کەوتە فکری ئەوەی خۆی دەرمانخوارد بکات بۆئەوەی کاتێ ڕیابۆڤسکی گەڕایەوە ماڵ بەسەر تەرمی ویدا بکەوێ، بەڵام دواتر کەوتەوە یادی ژووری میوانی ماڵی خۆیان و ژووری کاری دیمۆڤ و بەخەیاڵ وای لە مێشکی خۆی دا بەرجەستە کرد کە بێ جووڵە



بەتەنیشت دیمۆڤەوە دانیشتوە و چێژ لە دەروونی ئارام و جەستەی پاکی خۆی وەردەگرێ و شەویش دەچێتە شانۆ و گوێ لە ئاوازی ( مازینی *) دەگرێ. دڵی بۆ دونیای پێشکەوتو و هاتوهاوار و جەنجاڵی شار و مرۆڤە بەنێوبانگەکان وەتەنگ هاتبوو.

ژنەی لادێیی هاتە نێو کوختەکە و بە ئارامیی و بێ پەلەپەل کەوتە داگیرساندنی زۆپا دارییەکە تا شتێك بۆ خواردن ئامادە بکات. بۆن سوتاو هات و کەشوهەوای نێو ژوورەکە بە هۆی دوکەڵەوە بڕێك شین هەڵگەڕا. نیگارکێشەکان بە پێلاوی پاژنەبەرزی قوڕاوییەوە و بە ڕوخساری تەڕەوە هاتنەوە کوختەکە، سەیری کارە ناتەواوەکانیان دەکرد و دڵی خۆیان بەوە دەدایەوە کە ڤۆلگا سەرباری ئەو کەشوهەوا خراپ و باراناویەش هێشتا جوانییەکی تایبەت بە خۆی هەیە. کاتژمێرە هەرزانبەهاکە بە دیواری کوختەکەوە: تیك - تاك، تیك - تاك ... لە گۆشەی تایبەت بە شەمایلی قەدیسان، مێش و مەگەزە قێزەونە پاییزیەکان بەگێزەگێز لێك خڕ ببوونەوە، لە ژێر سەرچەقی نیمکێتەکانەوە دەنگی سیسرکە دەهاتە بەرگوێیان ... سەروەختی ئێوارێ ڕیابۆڤسکی گەڕایەوە کوختەکە، پێلاوەکانی قوڕاوی و خۆشی شەکەت و ماندوو و ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو. کلاوەکەی دانایە سەر کورسییەکە و لەسەر نیمکێتەکە دانیشت و چاوەکانی داخست. پاشان لەحاڵێکدا کە هەوڵی دەدا پێڵوەکانی لێك بکاتەوە، برۆکانی هەڵتەکاند و گووتی:

- ئای کە ماندوم ...

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا کە لە لایەکەوە دەیویست خۆی لای ڕیابۆڤسکی شیرن بکا و لەلایەکی تریشەوە وا خۆی بنوێنێ کە دڵی لێی نەڕەنجاوە، چووە لای و ئارام و بێ دەنگ قژە کاڵەکەی ماچ کرد و بە نەرمیی کەوتە شانەکردنی - حەزی

دەکرد قژی شانە بکات. ڕیابۆڤسکیش بە شێوەیەك ڕاچڵەکی وەك ئەوەی
شتێکی سارد بەر جستەی کەوتبێت، پاشان چاوی کردەوە و پرسی:
- چی بووە؟ چ دەکەی؟ تکات لێ دەکەم وازم لێ بێنە.
دواتر ئۆلگای بە پاڵێك لەخۆی دوور خستەوە و خۆشی برێك کشایە دواوە.
ئۆلگا وای بە خەیاڵدا هات کە شوێنەواری نەفرەت و پەشیمانی بە ڕوخساریەوە
دیارە. لەم کاتەدا ژنە لادێییەکە بەخۆی و قاپێکی پڕ لە ئاشەوە کە بە هەردوو
دەست گرتبووی وەژوورکەوت و لەبەردەم ڕیابۆڤسکی داینا و ئۆلگا ئیڤانۆڤنا
پەنجە ئەستور و نارێکەکانی ژنەی بینی کە بەنێو ئاشەکەدا چووبوونە خوارێ.
ئێستا ئیدی چ ئەو ژنە لادێییە پیس و تەنگەزلە و چ ڕیابۆڤسکی کە خەریکبوو
بە هەڵپە و تامەزرۆییەوە ئاشەکەی دەخوارد، چ ئەو کوختەخانوە لادێییانەیە و
چ ئەو شێوە ژیانە - کە سەرەتا بەهۆی سادەییەوە جوانبوو بەلایەوە، لە بەرچاوی
ترسناك خۆی دەنواند و شایانی ئەوە نەبوو مرۆڤ تێیدا بژی.
لەناکاو هەستی کرد سوکایەتیان پێ کردووە، پاشان بە ساردیەکەوە گووتی:
ئێمە دەبێ بۆ ماوەیەك لێکدی دابڕێین گەرنا دەترسێم کارمان بگاتە شەڕ و
زیزبوون. من ئیدی لەم ژیانە وەتەنگ هاتوم، هەر ئەمرۆ لێرە دەڕۆم.
- بەچی؟ بە ئەسپەدارینە؟
- ئەمرۆ پێنج شەممەیە . دەمژمێر دە و نیو کەشتی دەگاتە ئێرە.
ڕیابۆڤسکی دەست و دەمی بە خاولیەك سڕین و بەنەرمی گووتی:
- ڕاست دەکەی؟ بەڵێ، هەق بە تۆیە. وەرێکەوە ... جگە لەوەی لێرە بێکاریت
هەست بە خەفەت و دڵتەنگیش دەکەی. بۆیە ئەگەر پێش بە ڕۆیشتنت بگرم
دیارە کەسێکی زۆر خۆویستم. لە دوای بیستی سێپتەمبەر یەکتر دەبینینەوە.



ئۆلگا ئیڤانۆڤنا بە شادی و خۆشیەوە کەوتە پێچانەوەی بارگە و بەندەڵی خۆی،
لێوەکانی لەخۆشییان وەك گوڵ سور هەڵگەڕابوون. لەخۆی دەپرسی: (( دەبێ
ڕاست بێ کە بەم زووانە لە ژووری میوانی ماڵی خۆمان دانیشم و بکەومە
وێنەکێشان و لەژووری نووستنی خۆشمدا بنووم و لەسەر ئەو مێزەی کە
سەرچەفێکی سپی بەسەرەوەیە دانیشم و نان بخۆم؟ ئاهێکی خۆشی بەدڵدا هات
و ئیدی لەوەدوا لە ڕیابۆڤسکیش زویر نەبوو.
- ڕیابووشا با فڵچە و بۆیەکانم لای تۆ بن، ئەگەر شتێکیان لێ مایەوە لەگەڵ
خۆتا بیهێنەوە شار ... ئاگاداربە و نەکا چاوی منت لێ دیار نەبێ و بیدەیتە
تەوەزەلی و دڵتەنگ بیت ... تا توانات هەیە کار بکە. شانازییت پێوە دەکەم.
ڕیابووشا.
لە کاتژمێر نۆی بەیانی وەکو ماڵاوایی و بەڕێکردن، ڕیابۆڤسکی ئۆلگای
لەنێو کوختەخانوەکەدا ماچ کرد، تا ناچار نەبێ لەلای نیگارکێشەکانەوە ماچی
بکا - و تا بەندەرەکەش بەڕێی کرد. زۆری نەخایاند کەشتی لەنگەری گرت و
دەمژمێرێك دواتر ئۆلگای لەگەڵ خۆیدا برد.
دوای دوو شەو و سێ ڕۆژ گەیشتەوە ماڵ. بێ ئەوەی کڵاو و بارانییەکەی
داکەنێ، لەحاڵێکدا کە لەخۆشیان خەریکبوو هەناسەی ڕاوەستێ و بەقورسی
هەناسەی دەدا، سەرەتا چووە ژووری میوان و پاشان لەوێوە چووە ژووری
نووستن. دیمۆڤ بەبێ کۆت و بە چاکەتێکی دوگمە دانەخراوەوە لەسەر مێزەکە و
بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ دانیشتبوو و بە مەبەستی تیژکردنەوە چەقۆی بە
چنگاڵێکدا دەسوی، سوێسکەیەکی کوڵاو لەنێو دەفرەکەی بەردەمی بوو. ئەو
کاتەی کە ئۆلگا دەیەویست پێ بنێتە ژوورەوە لەسەر ئەو باوەڕە بوو ئەو
ڕوداوانە لە دیمۆڤ بشارێتەوە و دڵنیاشبوو لەوەی بۆ ئەم مەبەستە هەم توانای
پێویست و هەم لێهاتوویەکی باشی هەیە، بەلاّم بە بینینی زەدەخەنەی جوان و

پڕ لەشادی و چاوانی لەخۆشیان تروسکەداری مێردەکەی، هەستی کرد شاردنەوەی ئەو ڕاستیانە لە پیاوێکی لەم چەشنە، گوناهێکی بێ شەرمانە و نەفرەتاوییە و کارێکی لەکردن نەهاتوو و لە توانا بەدەری وەك دزیی و پیاوکوشتنە. پاشان بیریکردەوە و بڕیاری دا تەواوی ڕووداوەکەی بۆ بگێڕێتەوە، دوای ئەوەی بوواری دایە دیمۆڤ ماچی بکات و لە ئامێزی بگرێ، لەبەر پێیانیدا دانیشت و ڕوخساری خۆی لە نێو هەردوو لەپی دەستی دا شاردەوە. دیمۆڤ بە تۆنێکی لەبارەوە پرسی:

- چیە؟ چی بووە؟ بۆچی دڵتەنگی؟

ژنە ڕوخساری لە شەرمان سوورهەڵگەڕاوی هەڵبڕی و نیگایەکی پڕ لە تکا و پاڕانەوە و گوناهی بڕیە دیمۆڤ، بەڵام ترس و شەرم بوونە بەربەستی ئەوەی بتوانێ دان بە گوناهەکانیدا بنێ، تەنیا گووتی:

- شتێکی وانییە ... هەروا ...

دیمۆڤ ئۆلگای لە زەوی بەرز کردەوە و داینیشاندە سەر کورسیەك و گووتی:

- وەرە دانیشین ... ئاوا ... دەی گۆشتی سوێسکە بخۆ. بەستەزمان پێدەچێ زۆر برسیت بێ!

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا هەوای دڵنشین و خۆشەویستانەی ماڵەکەی خۆی تامەزرۆیانە و بەوپەڕی پەرۆشیەوە هەڵدەمژی و کەوتە خواردنی گۆشتی سوێسکە و دیمۆڤیش بە چاوانێکی لێوانلێو لە سۆز و خۆشەویستیەوە لێی دەڕوانی و بە شادیەوە پێدەکەنی.

## 6

دیمۆڤ لە ناوەڕاستی زستاندا وردە وردە هەستیکرد فریوی دەدەن. ئیدی نەیدەتوانی ڕاستەوخۆ سەیری چاوانی ئۆلگا بکات - وەك بڵێی ئەو ویژدانی



نائاسودە بێ نەك ئۆلگا - وە کاتێ لەگەڵیدا بەرەوڕوو دەبۆوە نەیدەتوانی وەك جاران بەدەمیەوە پێبکەنێ و زەردەخەنەی بۆ بکات، وە ئێستا بەو مەبەستەی تا ئەو شوێنەی دەکرێ بەتەنیا لەگەڵیدا نەمێنێتەوە، زۆربەی جاران هاوکارێکی خۆی بەنێوی ( کرۆستلۆڤ ) ی بۆ نانی نیوەڕۆ لەگەڵ خۆیدا دێنایەوە. ئەم پیاوە کورتەباڵایە قژتاشراوە ئەوەندە شەرمن بوو هەرجارێ قسەی لەگەڵ ئۆلگا ئیڤانۆڤنادا کردبا قۆپچەکانی چاکەتەکەی یەك یەك دادەخستن و دەیکردنەوە و بەدەستی ڕاستیشی یاری بە سەری تاڵەموەکانی لاسمێڵی چەپی دەکرد. دیمۆڤ و هاوکارەکەی لە کاتی نانخواردن دا دەکەوتنە باسی بابەتە زانستیی و پزیشکییەکان - ئیدی لە دڵسستییەوە تا دیادی نەخۆشیە دەروونییەکان. یان بۆ نموونە تەرمێك کە وایانزانیبوو هۆکاری مردنەکەی ( کەم خوێنیی ) یە کەچی دوای توێکاریی تەرمەکە، دیمۆڤ بۆی دەرکەوتبوو هۆکاری مردنەکەی شێرپەنجەی گەدە بووە و شتی لەم بابەتە ... پێدەچوو گفتوگۆی ئەو دوانە تەنیا لەبەر ئەوەبێ ئۆلگا بێدەنگ بکەن، یان بە واتایەکی تر وابکەن درۆ نەکا، کۆرستلۆڤ دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ دەچووە سەر پیانۆکە و دیمۆڤیش بە ئاه هەڵکێشانەوە دەیگووت:

- لێدە برا! شتێکی خەمناك لێدە!

کۆرستلۆڤیش شانەکانی هەڵدەتەکاند و پەنجەکانی لێك دەکردەوە و چەند ئاکۆردێکی دەگرت و بە دەنگێکی تیژەوە تێی هەڵدەکرد: (( دێرێکم نیشان بدە کە دێهاتیەکی ڕوس تێیدا نەناڵێنێ*)). دیمۆڤ دیسانەوە ئاهێکی هەڵدەکێشا و دەستی دەخستە بەر چەناگەی و لە فکران ڕادەچووو.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا بەو دواییانە زۆر نائاگا و بێ باك ببوو. بەیانیان بەبێ ئارەزویی و نائومێدیەوە لەخەو هەڵدەستا و بیری دەکردەوە لەوەی کە چیتر ڕیابۆڤسکی خۆشناوێت و سوپاس بۆ خودا کە هەموو شتێ کۆتایی پێ

هاتووه، بەلاّم دوای ئەوەی کە قاوەکەی دەخواردەوە توشی ئەو گومانە دەبوو کە ڕیابۆڤسکی مێردەکەی لەدەست دەرهێناوە، بەشێوەیەك کە ئیدی نە دیمۆڤی هەیە نە ڕیابۆڤسکیش. دواتر قسەی دۆستان و ئاشنایانی دەهاتەوە یاد کە پێیان دەگووت ئەو گەنجە نیگارکێشە بۆ کردنەوەی پێشانگایەکی تایبەت بە کارەکانی خۆی سەرگەرمی کێشانی تابلۆیەکی سەرسوڕهێنەرە - پێکهاتەیەك لە سروشت و ژیان، پێکهاتەیەك لەشێوازی کارەکانی (پۆلینۆڤ*) - هێندە بەرهەمێکی دەگمەن و دانسقەیە هەرکەسێ بچێتە شوێنکارەکەی و ئەو بەرهەمە ببینێ شەیدای دەبێ. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا بیری دەکردەوە کە تاکە هۆکاری ئافراندنی ئەم بەرهەمە بالاّیانە عیشقی وی بووە بەسەرییەوە بۆیە توانیویەتی بەرهەمێکی ئاوا دەگمەن و ناوازەی لەو شێوەیە بئافرێنێ و بە شێوەیەکی گشتیی: بوونی ئەوە وایکردووە کە ڕیابۆڤسکی بتوانێ بەرهەمی باشتر بخولقێنێ. کاریگەری عیشقی خۆی هێندە بە یارمەتیدەر و بەرچاو دەزانی بەسەر ڕیابۆڤسکیەوە کە وا هەستی دەکرد ئەگەر واز لەو نیگارکێشە لاوە بێنێ ئەوا بەجارێ نابوود دەبێ. بیری کەوتەوە کە دوایین جار ڕیابۆڤسکی هاتبووە دیداری چاکەتێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی لەبەردابوو، کراواتێکی تازەشی بەستبوو، بە چاوە خومارەکانییەوە لە ئۆلگای ڕووانیبوو و پرسیبووی: (( جوانم وەنییە؟)). لە ڕاستیشدا بە موە تیژ و چاوەشینەکانییەوە زۆر جوان بوو ( یان لانیکەم ئۆلگا وای هەست دەکرد). ئەو ڕۆژە ڕەفتاری لەگەڵ ئۆلگادا خۆشەویستانە و میهرەبانانە بوو. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا شتەکانی ڕابردوی وەبیر خۆی دێنانەوە، دواتر لیباسەکانی لەبەردەکرد و بە حاڵەتێکی پڕ لە جۆشوخرۆشەوە دەچووە شوێنکارەکەی ڕیابۆڤسکی و دەیبینی کە چۆن و بە چ جۆشوخرۆش و خۆشحاڵییەکەوە لەبەردەم تابلۆ بەشکۆیەکەی دا ڕاوەستاوە. ڕیابۆڤسکی دەیکردە گاڵتە و پرسیارە جددییەکانی ئەوی بە گاڵتە و فشقیاتەوە وەلاّم



دەدایەوە. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا هەستی بە نەفرەت و ئێرەیی دەکرد بەرامبەر تابلۆکە بەلاّم لەڕووی ڕێزەوە نزیکەی پێنج خولەکێك بەدیاریەوە ڕادەوەستا، دواتر - وەك چۆن لەبەرامبەر شتە پیرۆزەکاندا ئاه هەڵدەکێشن - ئاهێکی هەڵدەکێشا و بەنەرمییەوە دەیگووت:

- تۆ هیچ کات کارێکی ئاوا بەرز و بالاّت نەخولّقاندوە. دەزانی، تەنانەت ترسناکە.

وەدواتر لە ڕیابۆڤسکی دەپاڕایەوە و تکای لێ دەکرد کە خۆشی بووێ. تەنیای نەکات و بەزەیی بە بێچارەیی و بەدبەختییەکەی دا بێتەوە، دەگریا و دەستەکانی ئەو نیگارکێشە گەنجەی ماچ دەکرد، داوای لێ دەکرد سوێندی بۆ بخوات کە خۆشیدەوێ، هەوڵی دەدا بەو نیگارکێشە گەنجەی بسەلمێنی کە ئەگەر کاریگەری ئەرێنی عیشق و خۆشەویستی وی نەبێ ئەوا ئەو گومڕا و سەرلێشێواو دەبێ و بەم شێوەیە دوای ئەوەی کاتە شیرنەکانی ڕیابۆڤسکی دەکردە ژەهر، خۆی بە زەلیل و لاواز دەزانی. پاشان بەرەو لای بەرگدورەکەی یان هونەرمەندێك دەڕۆیشت تا بلیتێك وەدەست بێنێ.

هەرکاتێ ڕیابۆڤسکی لە شوێنکارەکەی نەبینیبا، نامەیەکی بۆ جێدەهێشت و تیایدا سوێندی دەخوارد و پێی دادەگرت لەسەر ئەوەی ئەگەر هەر ئەو ڕۆژە نەیەتە دیداری، ئەوا خۆی دەرمانخوارد دەکا و خۆی دەکوژێ. وە ڕیابۆڤسکیش لەترسان دەچووە ماڵ بۆ لای و نانی نیوەڕۆشی لەوێ دەخوارد. ئەو، واتا ڕیابۆڤسکی، بێ لەڕوودامان و شەرمکردن لە دیمۆڤ، لەگەڵ ئۆلگا ئیڤانۆڤنادا ڕەفتاری دەکرد. ئۆلگاش بە بێباکی و چاوقایمییەوە وەلاّمی قسەکانی ئەوی دەدایەوە. هەردوکیان وایان هەست دەکرد بوونەوەرێکی کەللەشەق و سەرسەختن و کۆسپی بەردەم یەکتر و بێزارکەری یەکترن ... ڕەفتار و گوفتاریشیان تێکەڵ بە توندیی و زبریی بوو، پاشان توشیی ڕق و زیز بوون

دەبوون و بەو هۆیەشەوە لەو ساتانەدا هیچیان هەستیان بەوە نەدەکرد بەشێوەیەك بێ ڕێز دەبن بەرامبەر یەکتر، کە تەنانەت کۆرستلۆڤیش بەو سەرە تاشراوەیەوە لە هەموو شتێکی نێوانیان دەگات. ڕیابۆڤسکی دوای نانخواردن دەکەوتە پەلەپەلی ڕۆیشتنەوە و ئۆلگا ئیڤانۆڤناش لە ڕاڕەوەکەوە نیگایەکی لێوانلێو لە ڕق و نەفرەتی لێ دەکرد و دەیپرسی:

- دەچیە کوێ؟

ڕیابۆڤسکی ڕوی خۆی ترش و تاڵ دەکرد و چاوەکانی بچووك دەکردنەوە و ناوی ژنێکی ئاشنای دەهێنا. بەڕوونی پێیەوە دیاربوو جگە لە بزواندنی هەستی دڵپیسی کردن و ئیرەیی ئۆلگا و سەرخستنەسەری، هیچ مەبەستێکی تری نەبوو لەو قسەیە.

ئۆلگا دەچووە ژووری نووستنی خۆی و لەسەر جێگاکەی ڕادەکشا، غیرەکردن و هەستی ئیرەیی و پەشیمانی، هەروەها هەستکردن بە شەرم و لاوازیی، وایان لێ دەکرد گاز لە سەرینەکەی بگرێ و بەدەنگی بەرز بگری. دیمۆڤ، کۆرستلۆڤی لەژوورێ بەتەنیا بەجێ دەهێشت و دەچووە لای ئۆلگا و بە شێواوی و دەستەپاچەییەوە دەیگووت:

- مەگری، ... لەبەرچی دەگری؟ لەم حاڵەتانەدا مرۆڤ دەبێ بێدەنگی هەڵبژێرێ ... نابێ بەسەرخۆیدا بێنێ ... مانگا مرد و دۆ بڕا ...

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا لەو دەمانەدا نەیدەزانی ئەو هەستی ئیرەیی و دڵپیسیی لێکردنە قورسەی خۆی کە شەقیقەکانی وەئازار دێنا بەچ شێوەیەك سەرکوت بکا و بەئومێدی دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك دەموچاوی خۆی تەڕ دەکرد و دەستێکی بە ڕوخساری فرمێسکاویی خۆی دا دێنا و بەپەلە بەرەو لای ئەو ژنەی کە ڕیابۆڤسکی نێوی بردبوو، دەکەوتەڕێ. دوای ئەوەی کە ڕیابۆڤسکی لەوێ نەدەبینی بەرەو لای ژنێکی تر و دیسانەوە ژنێکی تر دەکەوتەڕێ ... لە ڕۆژەکانی



سەرەتادا لەو هەموو گەڕان و سوڕانە توشی سەرەگێژکە دەبوو بەڵام دواتر بەچەشنێك خووی بەم کارەوە گرت کە هەندێك جار بۆ دۆزینەوەی ڕیابۆڤسکی سەری لە هەموو ژنە ناسیاوەکانی خۆی دەدا. ئەڵبەتە دەبێ ئەوەش بگوترێ کە هەموو ئەو ژنانەی ئەو دەچووە لایان دەیانزانی بە چ مەبەستێکەوە هاتوە.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا ڕۆژێك ڕووی کردە ڕیابۆڤسکی و گووتی:

- ئاکاری جوان و بەرزی دیمۆڤ ئازارم دەدا!

بەرنامەی ژیانی، چەشنی ساڵی پێشوو بوو. لە میوانداریەکانی شەوانی شەممە، ئەکتەری شانۆ بەدەنگەوە شیعری دەخوێندەوە، نیگارکێشەکان سکێچیان دەکێشا و تابلۆیان دەنەخشاندن، کەمانچەژەن سەرگەرمی موزیك بوو، گۆرانیبێژی ئۆپێرا گۆرانی دەگووت. بەردەوامیش دروست لەکاتی خۆیدا واتا لە دەمژمێر یانزە و نیوی ڕێك، دەرگای ژوری نانخواردن دەکرایەوە و دیمۆڤ بەزەردەخەنەوە دەیگوت:

- بەڕێزان نان ئامادەیە، فەرمون وەرنە سەرمێزەکە.

ئۆلگا چەشنی ساڵی ڕابردو لەهەوڵی ئەوەدابوو کە لەگەڵ کەسانی ناسراودا بناغەی ئاشنایەتی داڕێژێ و بەهەمان شێوەی جاران، دوای ماوەیەك تێپەڕین بەسەر ئەو ئاشنایەتیە و وەڕەزبوون لێیان، دیسانەوە هەوڵی پەیداکردنی کەسانی ناسراوی تری دەست پێدەکردەوە. وەك جاران درەنگ دەگەڕایەوە ماڵ، بەڵام ئێستا بەپێچەوانەی ساڵی ڕابردوەوە دیمۆڤی هەمیشە بە بێداریی دەبینی - لەسەر مێزی کارکردنی دانیشتبوو و سەرگەرمی ئەنجامدانی کارێك بوو - ئیدی ئێستا مێردەکەی دەمژمێر سێی بەیانی دەنوست و هەشتی بەیانی بێدار دەبۆوە.

شەوێکیان بەر لە چوون بۆ شانۆ لەبەردەم ئاوێنە بالائماکەی ژوورەکەی خۆیدا ڕاوەستابوو، دیمۆڤ بە فراك و فەرەنجێکی سپیەوە وەژوور کەوت. زەردەخەنەیەکی

جوانی بەسەر لێوەوە بوو چەشنی ڕابردوو ڕاست سەیری چاوەکانی وی دەکرد، دانیشت و دەستێکی بە چۆکەکانی خۆیدا کێشا و گووتی:

- دەمژمێرێك لەمەوبەر سەرکەوتوانە بەرگریم لە نامەکەم کرد.

ئۆلگا پرسی:

- بەرگریت کرد؟

- بەڵێ.

پاشان گەردەنی بەرز کرد تا ڕوخساری ئۆلگا - کە هێشتا پشتی لێی بیو و سەرگەرمی قژ داهێنانی خۆ بوو - لە ئاوێنەکەدا ببینێ. پاشان دووبارەی کردەوە:

- بەڵێ! پێدەچێ کورسی پسپۆڕیی نەخۆشیناسیی گشتیم بۆ دەسنیشان بکەن، واپێدەچێ.

قیافەی شادمانانەی، نیشانی دەدا کە لەو شادیی و خۆشیی و سەرکەوتنەدا تەنیا ئاوێنەکە لەگەڵیدا بەشدارە و بێ شك و گومان قەڵەمی لێبووردن بەسەر گوناهەکانیدا - چ هی ئیستا و چ هی ڕابردوی - دا دێنێ و هەمووشتێك بە فەرامۆشی دەسپێرێ، بەلاّم ژنەی گەنج نە سەری لە کورسی پسپۆڕیی دەردەکرد نە لە نەخۆشیناسیی گشتی. لەوە گەڕێ! دەترسا بە شانۆگەریەکە ڕانەگا، هەربۆیە بێدەنگیی لێ کرد.

## 7

ئەو ڕۆژە خراپترین و ئازاردەرترین ڕۆژ بوو.

دیمۆڤ ژانەسەرێکی قورسی لێ بوو، نە نانی بەیانیی خوارد، نە توانی بچێتە نەخۆشخانەش، بەڵکو لەسەر کاناپەی ژووری نووستن ڕاکشا. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا وەك جاران لە دەمژمێرەکانی بەیانیدا خۆی گەیاندە شوێنکارەکەی ڕیابۆڤسکی



تا سکێچی ( سروشتی بێ گیان ) ی نیشان بدا و لێشی بپرسێ لەبەرچی دوێنێ نەهاتە سەردانی.

بێئەوەی لە زەنگی دەرگا بدا خۆی بە شوێنکارەکەی ڕیابۆڤسکیدا کرد و لە کاتی دانانی پێلاّوەکانی لە ڕاڕەوەکە، دەنگی خشەخشی کراسی ژنێکی هاتە بەرگوێ کە بەخێرایی بەنێو شوێنکارەکەدا هەنگاوی دەنان. ئۆلگا بەپەلە خۆی بە ژورێدا کرد بەلاّم تەنیا چمکی دامێنی کراسێکی قاوەیی بینی کە لەو کاتەدا لە پشت تابلۆیەکی گەورەوە - کە بەسەر سێپایەکەوە و بە سەرچەفێکی ڕەش کە لەزەوی دەخشا داپۆشرابوو - ون بوو. بێ شك ژنێك لەپشت تابلۆکەوە خۆی شاردبۆوە. بیری کەوتەوە خۆشی زۆر جاران لەپشت ئەو تابلۆیەوە خۆی پەنا دابوو! ڕیابۆڤسکی - کە شڵەژاو دیاربوو - وا خۆی نیشاندا لەم هاتنەی ئەو سەری سوڕماوە. هەردوو دەستی بۆ لای ئۆلگا درێژ کردن و گووتی:

- ها ... بە بینینت خۆشحاڵم. چی تازە هەیە؟

چاوەکانی ئۆلگا پڕبوون لە فرمێسك. هەستی بە ژان و سەرەگێژکە دەکرد، بە هیچ نرخێك ئامادە نەبوو لەلای ژنێکی بێگانەوە - خەنیمێکی درۆزن کە لە پشت تابلۆکەوە ڕاوەستابوو و پێدەچوو چەپەلاّنە پێبکەنێ - ورتەی لەدەم بێتە دەرێ. پاشان لەکاتێکدا کە لێوەکانی تەتەڵەیان دەکرد بە دەنگێکی ناسك و لەرزۆکەوە وەلاّمی دایەوە:

- سکێچێکم هێناوە ... سروشتی بێ گیان ...

- ئەها ... سکێچ؟

سکێچەکەی لە ئۆلگا وەرگرت و بەدەم ڕوانینەوە وەك ئەوەی کە پێشتر مەبەستی نەبووبێ بەرەو ژورەکەی تەنیشت ڕۆیشت. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا گوێڕایەلاّنە کەوتەدوای. ڕیابۆڤسکی لەژێر لێوەوە و بە مینگەمینگ کەوتە قافیەسازی:

سروشتی بێ گیان ... لێیدا سندان ... خواردیان سەگان ... قەشمەرپیاوان ...
لەنێو شوێنکارەکەدا دەنگی پێ و خشەخشی کراسی ژنان هاتەوە بەرگوێ.
پێدەچوو باڵندەکە نیازی هەبێ لە قەفەزەکە دەرچێ. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا دەیویست بقیژێنێ، دەیویست شتێکی قورس بکێشێ بە سەری ڕیابۆڤسکی دا و ڕاکا بەلاّم لەبەر فرمێسکی قەتیسماوی چاوەکانی هیچ شوێنێکی نەدەبینی، وەختابوو بتەقێ لە خەفەتان، ئیدی خۆی بە ئۆلگا و هونەرمەندێکی نیگارکێش نەدەزانی بەڵکو خۆی بە زیندەوەرێکی بچووکی ناشایستە دەزانی.
ڕیابۆڤسکی لە حاڵێکدا بۆئەوەی خەوی لێ نەکەوێ سەری خۆی دەلەقاند، سەرنجێکی گرتە سکێچەکەی ئۆلگا و بە بێ شەرمیی و خەواڵوویییەوە گووتی:
- ماندوم ... ئەڵبەتە کارەکەت جوانە بەلاّم خۆ تۆ ساڵێ ڕابردوش هەر خەریکی سکێچ بوویت، مانگێکی تریش هەر خەریکی سکێچ دەبیت ... ماندونەبوویت لەم هەموو سکێچە؟ من لەجێی تۆ بام وازم لە نیگارکێشیی دێنا و دەچووم خۆم بە موزیکی جدی یان کارێکی ترەوە خەریکدەکرد ... خۆ تۆ نیگارکێش نیت ... تۆ موزیکژەنیت. خۆزگە دەتزانی چەندە ماندوم! ئێستا پێیان دەڵێم چامان بۆ بێنن ... پێت چۆنە؟
ئەمەی گوت و لە ژورەکە چووە دەرێ و ئۆلگا دەنگی قاچەکانی و دەنگی خۆیشی بیست کە ڕاسپێریی دەدایە خزمەتکارەکەی. ئۆلگا بەمەبەستی هەلاّتن لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕیابۆڤسکی و گوێ نەگرتن لە ڕونکردنەوە و شیکردنەوەکانی و لەهەمووی گرینگتر لەترسی ئەوەی نەکا توانای دان بەخۆدا گرتنی نەمێنێ و بداتە سوڕەی گریان، بەرلەوەی ڕیابۆڤسکی بگەڕێتەوە بەخێرایی بەرەو ڕاڕەوەکە ڕۆیشت، پێلاّوەکانی کردەپێ و بەرەو کۆلاّنەکە بۆی دەرچووو.



کاتێ گەیشتە کۆلاّنەکە، ئاهێکی ئاسودەی هەڵکێشا و هەستیکرد کە ئیدی بەیەکجاری خۆی لە کۆتوبەندی ڕیابۆڤسکی و نیگارکێشان و ئەو سەرەگێژکەیەی قورسایی خستبووە سەر، ڕزگار کردووە. بەخۆی گووت: ((ئیدی بەسە تەواو! )).
لەوێوە یەکڕاست بۆ لای بەرگدورەکەی خۆی ڕۆیشت و دواتریش بۆ لای هونەرمەندە ئەڵمانییەکە کەناوی بارنای بوو و ڕۆژی پێشوو هاتبووە شارەکەیان و لەوێشەوە چووە فرۆشگایەکی فرۆشتنی نۆتەی موزیك. بەدەم ڕێگاوە بیری دەکردەوە کە دەبێ نامەیەکی سارد و توند و پڕ لە عیزەتی نەفس و شکۆمەندانە بۆ ڕیابۆڤسکی بنوسێ و لە وەرزی بەهار، یان هاوینیشدا لەگەڵ دیمۆڤی هاوسەری بچنە (کریمە) تا خۆی لە تۆز و پیسیی ڕابردو پاك کاتەوە و هەمو شتەکانی ڕابردوو بە فەرامۆشی بسپێرێ و دەست بە ژیانێکی نوێ بکاتەوە.
شەوێ درەنگ گەڕایەوە ماڵ و بێ ئەوەی جلەکانی دانێ ، لە ژووری میوانان دانیشت و کەوتە نوسینی نامەکەی. ڕیابۆڤسکی پێی گوتبوو ئەو نیگارکێش نییە و ئەویش لە وەلاّمی ئەو قسەیەدا دەیویست بۆی بنوسێ ئەوە ڕیابۆڤسکی خۆیەتی کە توانای ئافراندنی بەرهەمی بالاّی نەماوە و تەنیا خەریکی کاوێژ کردنەوەی کارەکانی ساڵانی پێشویەتی و بە واتایەکی تر: نەك تەنیا هیچی نوێی پێ نەماوە بەڵکو چەقی بەستوە و سەرەنجامیش لەوە زیاتر پێشناکەوێ و لەو ئاستەی خۆیدا دەمێنێتەوە. هەروەها دەیویست بنوسێ کە ئەو، واتا ڕیابۆڤسکی لە زۆربەی کارە جوانەکانی خۆی دا، قەرزاری کاریگەری عیشقی ئەمە بەسەر کارەکانییەوە، بەلاّم هەندێك جار ژنانی جێی گومان - بۆ نموونە وەك ئەو ژنەی ئەمڕۆ کە خۆی لەپشت تابلۆکەوە شاردبۆوە - دەبنە هۆکاری

پوچەڵ کرنەوەی کاریگەریە ئەرێنییەکانی ئەم بەسەر کارەکانییەوە و گۆڕانی ڕەفتاری لەبەرامبەریدا.

لەم کاتەدا دیمۆڤ لە ژووری کارەکەی خۆیەوە بانگی کرد:

- ئۆلگا! ئۆلگا!

- چیت دەوێ؟

- ئۆلگا، مەیە ژورەکەم، لەبەر دەرگاکە زیاتر مەیە! گوێبگرە ... سێ ڕۆژ لەمەوبەر لە نەخۆشخانە توشی ملەخڕە بووم و ئێستاش ... تەندروستیم باش نییە ... خێرا یەکێ بنێرە بەدوای کۆرستلۆڤ دا.

ئۆلگا، مێردەکەی و هەمو پیاوانی ئاشناشی بەناوی بنەماڵەییانەوە بانگ دەکرد نەك بەناوی خۆیان، بەتایبەت ناوی دیمۆڤی کە ئۆسیپ بوو هیچ بەدڵ نەبوو. چوونکە ئەم ناوە هەمو جارێ ئەوی دەخستەوە یادی دو دێڕی هاوواتای گۆگۆلەوە. بەلاّم ئەمجارەیان هاواری کرد:

- نا ! شتی وا ناکرێ ئۆسیپ!

دیمۆڤ لە ژورێڕا گووتی:

- هەرچی زووە یەکێ بنێرە بەدوای کۆرستلۆڤدا! تەندروستیم باش نییە ... دەی خێراکە!

وە ئۆلگا دەنگی قاچی ئەوی بیست کە چووو لەسەر کاناپەکە ڕاکشا و بە دەنگێکی کزەوە دووبارەی کردەوە: - دەی خێرابە!

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا کە لە ترسان سڕ ببوو، بیری کردەوە: (( ئەمە چیە؟ کەوابێ زۆر مەترسیدارە!)).

دواتر بێ ئەوەی پێویستی بە مۆم هەبێ مۆمەکەی هەڵگرت و چووە ژووری نووستن و لەوێ بیری کەوتەوە کە دەبێ کارێك بکات و بێ ئیختیار چووە بەردەم ئاوێنە بالاّنماکە. بە ڕوخساری ڕەنگ پەڕیوو و ترساو و چاکەتێکی قۆڵدرێژی



بەرسینگ بە پەڕپەڕەی زەرد و بە دامێنێکی نائاساییەوە، خۆی بە شتێکی ترسێنەر و نەفرەتهێنەر هاتە بەرچاو. لەناکاو لەبەرامبەر دیمۆڤ و لاوێتیەکەی و عیشقی بێ کۆتایی ئەو و تەنانەت جێگا چۆڵەکەشی - کە لەمێژبوو لەسەری نەدەنوست - بەشێوەیەکی ئازاراوی هەستی بە بەزەیی و دڵسۆزیی کرد و کەوتەوە یادی زەردەخەنە جوانەکەی. پاشان لە ناخی دڵەوە گریا و نامەیەکی پڕ لە تکا و پاڕانەوەی بۆ کۆرستلۆڤ نوسی. ئەو دەمە کات، دو دەمژمێر لە نیوەشەوێ ڕابردبوو.

## 8

ئەو کاتەی ئۆلگا ئیڤانۆڤنا لە دەمژمێر هەشتی بەیانیی بە قژی شێواو و قیافەیەکی شەرمەزارانە و ژانسەرێکی قورسی سەرچاوەگرتوو لە کەمخەویەوە، لە ژووری نووستن وەدەرکەوت پیاوێکی ڕیش ڕەش کە پێدەچووو دکتۆر بێت بەتەنیشتیدا تێپەڕی و چووە ڕاڕەوەکە.

بۆنی دەرمان ئەو ناوەی داگرتبوو. کۆرستلۆڤ لە تەنیشت دەرگای ژوورەکەی دیمۆڤ ڕاوەستابوو و دەستی ڕاستی بە لاسمێلی چەپی دا دەهێنا. ئەو کاتەی کە ئۆلگا لێی نزیك بۆوە ڕووی خۆی گرژ کرد و گووتی:

- ببوورە بۆت نییە بچیە ژوورێ، لەوانەیە تۆش بیگریتەوە. پێویست بە چوونەژوورەوەی تۆ ناکات. تەنیا وڕێنە دەکا و کەسیش ناناسێتەوە.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا بە لەسەرخۆیی پرسی:

- ڕاستە توشی ملەخڕە بووە؟

کۆرستلۆڤ بێ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە لە ژێر لێوەوە بە ورتەورت گووتی:

– ئەگەر ڕاستیەکەیت دەوێ ئەوانەی سەرکێشی بە ژیانی خۆیانەوە دەکەن دەبێ بدرێنە دادگا. تۆ دەزانی چۆن توشی ئەو دەردە بوو؟  سێشەممەی ڕابردوو هەولێدا کێم و چڵکی دومەڵی ملەخڕەی کوڕیژگەیەك بە سۆندەیەکی باریك هەڵمژێ و دەریبێنێ ... ئاخر بۆچی؟ ئەمە کارێکی گەمژانەیە ...

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا پرسی:

– جێگای ترسە؟ ... مەترسیی هەیە؟

– بەڵێ هەیەتی. دەڵێن ئەم جۆرەیان لە هەرە کوشندەکانە. ڕاستی دەبێ بنێرین بەدوای دکتۆر ( شرێك ) دا.

دکتۆرێك هات – بالآبەرز، تۆزێك پشتکووڕ، قژلول و لە شماسان دەچووو. دوای ئەویش دکتۆرێکی گەنجی چاویلکە لەچاوی هەندێك قەڵەو و لێوسور، خۆی کرد بە ماڵدا. ئەمانە ئەو دکتۆرانە بوون کە هاتبوون چاودێریی دیمۆڤ بکەن و بەدیاریەوە بن. هەرکاتێ نۆرە ئێشکی کۆرستلۆڤ تەواو دەبوو نەدەچۆوە ماڵی خۆی بەڵکو هەرلەوێ دەمایەوە و بەنێو ژورەکانی ئاپارتمانەکەدا وەك سێبەر دەهاتودەچووو. خزمەتکاری ماڵ چای بۆ ئامادە دەکردن و و بەردەوام بۆ کڕینی داوودەرمان بەرێی دەرمانخانەکانەوە بوو و کەسیش نەبوو دەستێك بە ماڵەکەدا بێنێ و هەندێك کۆیکاتەوە.  پەژارە و بێدەنگی، حوکمڕانیی ماڵ بوون.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا لە ژووری نووستن دانیشتبوو، بیری دەکردەوە لەوەی کە لەوانەیە خودا بەهۆی تاوانی خیانەت کردن لە مێردەکەی سزای بدات. لەوێ، لەودیو دەرگای ژووری کاری دیمۆڤەوە، بوونەوەرێکی کەمدوو و خۆمانە و درك پێ نەکراو – بوونەوەرێك  کە هێندە نەرم و نیان و گونجاو و دڵپاکە کە لە کەسایەتی و عیزەتی نەفسی خۆی خۆشبووە – بە بێدەنگیی و ئارامییەوە لەسەر کاناپەکەی ئازار دەچێژێ و ورتەی لێوە نایەت. وە ئەگەر هاتبا و ئەم بوونەوەرە بەدەم ورێنەوە سکالآی کردبا ئەوا بێشك دکتۆرە ئێشکگرەکان



دەگەیشتنە ئەو ئاکامەی کە دەردی وی تەنیا ملەخڕە نییە. خوا بەو ڕۆژە نەکا کە ڕاستییەکانیان لە زاری کۆرستلۆڤەوە گوێ لێ بێ: کۆرستلۆڤ ئاگاداری هەمموو شتێکە و لەخۆڕا نییە چەشنی تاوانباری سەرەکی لە خاتونی خاوەنماڵ دەڕوانێ، وە لەم نێوەشدا ملەخڕە، جگە لە ( هاوکاری تاوانبار )، بە هیچی تر نازانێ.

ئۆلگا ئیڤانۆڤنا ئیدی یادی شەوانی مانگەشەو و وتە ئاشقانەکانی ڕیابۆڤسکی و ژیانی شاعیرانەی نێو کوختەخانوە لادێییەکەی نەدەکردەوە بەڵکو دەیزانی بەهۆی کەمتەرخەمی و هەواوهەوەسێکی ناپەسند و نابەجێوە ئەوەندە خۆی پیس و چەپەڵ کردووە کە لە توانای هیچ ئامرازێکی پاککردنەوەدا نییە پاکی بکاتەوە ...

دەکەوتەوە یادی عیشقە بێ شەرمانە و خاڵی لە ئارامیی و ئاسودەییەکەی خۆی و ڕیابۆڤسکی و بیری دەکردەوە: (( وای چ درۆیەك نەما نەیکەم! نەفرەت لەو ڕوداوە!)).

ئۆلگا، دەمژمێر چوواری دوانیوەڕۆ لەگەڵ کۆرستلۆڤ دا دانیشتە سەر خوانی نانخواردن. دکتۆر دەمی لە نان نەدا، ڕوی گرژ کردبوو و سەری بە شەرابی سورەوە نابوو.  ئۆلگاش هیچی نەخوارد.  هەندێك جار لە دڵەوە نزای دەکرد و بڕیاری دەدا ئەگەر بێتو دیمۆڤی مێردی چاك بێتەوە ئەوا جارێکی تر خۆشیدەوێ و دەبێتە ژنێکی وەفادار بۆی، هەندێك جاریش ماوەی خولەکێك خۆی بە فەرامۆشی دەسپارد و لە کۆرستلۆڤ ورد دەبۆوە و دەکەوتە بیرکردنەوە: (( چۆن دەکرێ مرۆڤێك لە سادەیی و ناشایستەیی و گومناوی خۆی – ئەویش مرۆڤێك بەو قەدوقیافە نارێك و ڕەفتارە ناشیرنانەوە – توشی خەم نەبێ؟)).

هەندێك جاریش گومانی دەکرد بەهۆی ترسی توشبوون لە ملەخڕە تاقە جارێك چیە سەری لە مێردەکەی نەداوە و  خوداوەند لەسەر ئەم ڕەفتارە ئێستا تا ئێستا

ڕۆحی دەکێشێ. بەگشتی هەستێکی ترسنۆکانە و پەژاراوی سەرتاپای جەستەی گرتبۆوە و دڵنیابوو کە بەشێوەیەکی لەقەرەبوو نەهاتوو زەلیل و زەبوون بووە لە ژیاندا.

هەرکە نانی نیوەڕۆیان خوارد، دونیا وردە وردە تاریك داهات. کاتێ ئۆلگا ئیڤانۆڤنا گەڕایەوە ژووری میوان کۆرستلۆڤی بینی کە سەرینێکی بەرگ ئاوریشمیی خستبووە ژێر سەری و لە سەر کاناپەکە خەوتبوو و پرخەپرخی دەهات.

ئەو دکتۆرانەی کە دەهاتن و دەچوون، سەرنجیان نەدەدایە شڕوشەپڕێوی و شێواوی ناومالّەکە. نە کابرای نوستوی بە پرخوهۆڕی سەر کاناپەی ژووری میوان سەرنجی کەسی ڕادەکێشا، نە سکێچە بە دیواردا هەڵواسراوەکان، نە پرشوبلاّوی ژورەکان، نە کابانی قژ ئالّۆز و لیباس شێواو ...

یەکێك لە دکتۆرەکان بێ هۆ پێکەنی، ئاوازی پێکەنینەکەی هێندە سەیر و ترسناك بوو هەموانی ڕاچڵەکاند.

جاری دواتر کە ئۆلگا ئیڤانۆڤنا گەڕایەوە ژووری میوان، کۆرستلۆڤی بینی کە لەخەو هەستابوو و خەریکی جگەرەکێشان بوو. دکتۆر بە سرتە گووتی:

- ملەخڕەیەتی، دلّیشی زۆر باش نییە ... لە ڕاستیدا زۆر خراپیشە.

- بۆچی دکتۆر شرێك ئاگادار ناکەیتەوە؟

- هاتبوو. ئەو بوو کە نەخۆشیەکەی دەسنیشان کردبوو و گوتبووی کە نەخۆشیەکەی تەشەنەی کردووە و لێی کردۆتە ( موخاتی لوت ). لەو حالّەتەشدا جیاوازی من و ئەو تەنیا ئەوەیە: ئەو شرێکە و من کۆرستلۆڤم، تەنیا ئەوەندە.

کات زۆر بە خراپی دەڕۆیشت. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا بە هەمان ئەو جلوبەرگەی کە لەبەریدابوو لەسەر جیگاخەوە شێواوەکەی خۆی ڕاکشا و ویستی وەنەوزێك بدا.



وایدەزانی ژورەکەیان لە زەویەوە تا سایپیتەکە بە پارچە ئاسنێکی گەورە پڕ کردۆتەوە و تەنیا ئەوەندە بەسە ئاسنەکە بەرنەدەرێ تا شادی و خۆشی بالّ بەسەر هەمواندا بکێشێ. کاتێ وەنەوزەکەی لێ شێوا، بیری هاتەوە ئەوەی کە دلّودەرونی هەموانی پڕ کردووە لە پەژارە، پارچە ئاسن نییە بەلّکو ملەخڕەکەی دیمۆڤە کە قورسایی خستۆتە سەر دەرونی هەموان. جارێکی تر لە حالّێکدا کە خۆی لەبیرکردبوو، لەفکران ڕاچووو: (( سروشتی مردوو ... ئاسپێرت ... ڕاپێرت ... کەتیرە ... وەنەوز ... شرێك چیان بەسەر دێت؟ موشریك ... موشتەریك ... دەبێ ئەو ئاشنا و دۆستانەمان چ بکەن؟ لەکوێن؟ دەبێ بزانن گرفتاری چ دەرد و بەلاّیەك هاتوین؟ خودایە فریامان کەوە ... ڕزگارمانکە. شرێك ... موشریك ... موشتەریك...)).

دیسانەوە پارچە ئاسنەکە ... کات زۆر بە خراپی تێدەپەڕی ... بەلاّم زەنگی دەمژمێری ژورەکانی نهۆمی یەکەم بە هەندێك جیاوازی کاتەوە بیستران. دەنگی زەنگی دەرگا بەردەوام لە ڕاڕەوەکەدا دەنگی دەدایەوە - دکتۆرەکان دەهاتن و دەچوون. خزمەتکارەکە بە پەرداخێکی بەتالّ و سینییەکەوە وەژور کەوت و پرسی: خانم مۆلّەتم دەدەیتێ جێگاخەوەکەت بۆ ئامادە بکەم؟

لەبەرئەوەی وەلاّمێکی نەبیست لەژورەکە چووەدەرێ. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا لە دونیای خەیالّ و بێداری دا دەنگی زەنگی دەمژمێرەکەی - کە لە خوارێ لێی دەدا - هاتە بەرگوێ و لە خەونیدا ڕوباری ڤۆلّگا و ئەو بارانەی کە بەسەریدا دەباری، بینی. دیسانەوە وەك بلّێی یەکێك - بێگانەیەك - هاتە ژورێ. ڕاپەڕی و کۆرستلۆڤی ناسیەوە و لێی پرسی:

- دەمژمێر چەندە؟

- نزیکی سێیە.

- تەندروستی چۆنە؟

- خراپ! هاتوم پێت بڵێم خەریکە تەواو دەبێ ...
ئەمەی گوت و دایە پرمەی گریان و هەرلەوێ بەتەنیشت ئۆلگاوە، لەسەر لێواری چارپاکە دانیشت و فرمێسکەکانی سڕینەوە. ئۆلگا ئیڤانۆڤنا لەسەرەتادا لە وتەکانی تێنەگەیشت کەچی سەرباری ئەوەش سەرتاپای جەستەی سڕ بوو و خاوو خلیچکانە خاچێکی لەسەر سینگی خۆی کێشا.
کۆرستلۆڤ بەدەنگە ناسکەکەی خۆیەوە دوبارەی کردەوە:
- خەریکە تەواو دەبێ ...
پاشان بە گریانەوە درێژەیدایە:
- دەمرێ، دەیویست خۆی فیدا بکا ... چ زیانێکی لە قەرەبووکردنەوە نەهاتوە بۆ زانستی پزیشکی!
پاشان لەحاڵێکدا کە دەستەکانی لێکدی دەسویین، درێژەیدایە:
- بە هیچ کاممان بەراورد نەدەکرا، مرۆڤێکی گەورە و نائاسایی بوو! چەندە لێهاتوو بوو! چەندە بلیمەت بوو! ئومێدبەخشی دڵودەرونەکان بوو! ئای خودایە، زانایەك بوو لەم ڕۆژگارەدا بەچراش بگەڕێی لەوێنەی ئەوت بۆ نادۆزرێتەوە ... ئۆسکا دیمۆڤ، ئەمە چ کارێك بوو کردت! ئای خودایە!
پاشان ڕوخساری لێوانلێو لە خەموپەژارەی بە هەردوو دەستەکانی شاردەوە و سەرێکی ڕاوەشاند و بە تۆنێکی کە دەتگوت زۆر لە کەسێك توڕەیە، دیسانەوە درێژەی دایە:
- چ وزەیەکی مەعنەویی و ڕەوشتێکی جوانی هەبوو! مرۆڤێکی دڵساف و پاك و میهرەبان ... مرۆڤێکی ساف و ڕوون وەك شوشە. خزمەتی زانستی دەکرد و هەر لەڕێگای زانستیشدا گیانی خۆی بەخت کرد. ماندوبوونی نەدەزانی ... شەو و ڕۆژ کاری دەکرد و کەسیش بەزەیی پێدا نەدەهاتەوە. ئەم زانا لاوە، ئەم مرۆڤەی کە کورسیی پسپۆڕیی چاوەڕوانی بوو، ناچاربوو بەدیار نۆڕینگەوە



دانیشێ و شەوانەش کاری وەرگێڕان بکا تا بتوانێ پارەی کڕینی ئەم شتانە ... ئەم شتە پوچ و بێنرخانە دابین بکا!
پاشان بە چاوانی نەفرەتاوی و ڕقەوە ڕوانییە ئۆلگا و چنگی لە سەرچەفی چارپاکە گیر کرد و بە ڕقەوە ڕایکێشا وەك ئەوەی تاوانباری سەرەکی ئەو سەرچەفە بێت.
- نە خۆی بەزەیی بەخۆیدا دەهاتەوە نە خەڵکیش بەزەییان پێدا دەهاتەوە.
لەژووری میوانانەوە دەنگێکی گڕ بیسترا کە دەیگووت:
- بەڵی کاکە، مرۆڤێکی کەموێنە بوو!
ئۆلگا ئیڤانۆڤنا ساڵانی ژیانی خۆی بە تەواوی وردەکاریەکانەوە هێنایەوە یاد و لەناکاو درکی بەوە کرد لە ڕاستیدا دیمۆڤ بە بەراورد لەگەڵ هەموو ئەوانەی دەیناسین مرۆڤێکی کەموێنە و گەورە بوو. دواتر ڕەفتاری باوکی خوالێخۆشبووی و تەواوی دکتۆرەکانی تریشی بەرامبەر بە دیمۆڤ هێنایەوە یاد کە هەموان پێشبینی ئایندەیەکی گەش و درەوشاوەیان بۆ دەکرد. وە دیوارەکان و ساپیتە و چرا و فەرشەکەش بە زەردەیەکی تەوساویەوە لێیان دەڕوانی و وەك ئەوەی مەبەستیان بێ پێی بڵێن: (( قەدری ئەو مرۆڤە گەورەیەت نەزانی! تازە ڕۆیشت و لەدەستت چووو! )) دواتر بە گریانەوە لە ژوورەکە چووە دەرێ، لە ژووری میوانان بە خێرایی بە تەنیشت پیاوێکی نەناسدا تێپەڕی و چووە ژوری مێردەکەی. دیمۆڤ لەسەر کاناپەکە بێ جوڵە نوستبوو. بەتانییەکیان پێدادابوو. ڕوخسارە ڕەق و وشکەکەی - چەشنی ڕوخساری مردوان - زەرد هەڵگەڕابوو. تەنیا بە تەوێڵ و برۆ ڕەشەکانی و زەردەخەنە ئاشناکەیەوە دەناسرایەوە. ئۆلگا بە خێرایی دەستێکی بە سینگ و ناوچەوانی دیمۆڤدا هێنا. سینگی هێشتا گەرم بوو. بەڵام تەوێڵ و دەستەکانی سارد هەڵگەڕابوون. چاوە نیمچە کراوەکانی لەبری ئۆلگا لە بەتانییەکەیان دەڕوانی. ژنەی گەنج بە دەنگی بەرز بانگی کرد:

- دیمۆڤ! دیمۆڤ!

حەزی دەکرد بۆی ڕوون کاتەوە و پێی بڵێ ئەو ڕووداوانەی ڕابردن جگە لە هەڵەیەك هیچی تر نەبوون، هێشتا بووار ماوە و هەموو شتێك لەدەست نەچووە و هێشتا ژیان دەتوانێ جوان و شادیبەخش بێت، دەیویست بە دیمۆڤ بڵێ کە ئەو مرۆڤێکی کەموێنەیە و گەورەیە، دەیویست دڵنیای کاتەوە کە تا ماوە نزای بۆ دەکا و ڕێزی لێ دەگرێ ...

باوەڕی نەدەکرد دیمۆڤ بێدار نەبێتەوە، شانەکانی ڕاتەکاند و بانگی کرد:

- دیمۆڤ! دیمۆڤ! دیمۆڤ!

لەو کاتەدا کۆرستلۆڤ بە خزمەتکارەکەیانی گووت: پێویست بە پرسیار ناکا! بڕۆ بۆ کلیسا و ناونیشانی مردوشۆرەکان وەرگرە. خۆیان دێن و هەموو کارەکان جێبەجێ دەکەن.

پەراوێز:



(ژانریست و ئانیماڵیست و پیزاشیست*) سەبك و شێوازی جیاوازی نیگارکێشین.

( ترۆییتسێن*) پەنجایەمین ڕۆژی جەژنی پاك.

( مازینی *) گۆرانیبێژی ئیتالی 1844 - 1926

(( دێرێکم نیشان بدە کە دێهاتیەکی ڕوس تێیدا نەناڵێنێ*)) کۆپلەیەك لە پارچە شیعرێکی بەنێوبانگی

(( پۆلینۆڤ )) نیگارکێشێکی بەناوبانگی ڕوسیا بوو (1844 - 1927)

# ڤیاوێکی نائاسایی

کات، نزیك به یەکی دوای نیوەشەوە. پیاوێکی بالاّبەرز، به کلاّوێکی ڕەنگاوڕەنگ و باڵتۆیەکی باشلیقدارەوە لەبەردەم دەرگای حەوشەی ئاپارتمانی قەیرەکچێکی مامان بەناوی ماریا پترۆڤنا کۆشکینا، ڕادەوەستێ. لەنێو تاریکایی شەوی پایزدا نەڕوخساری دیارە نەدەستەکانی، بەلاّم بەهۆی شێوازی کۆخەکردنی و ڕاکێشانی پەتی زەنگی دەرگاکەوە، دیارە کە پیاوێکی سەختگیر و بەهێز و دەسرۆیشتوو و خاوەن خووڕەوشتی باشە. سێ جاران زەنگی دەرگاکە وەدەنگ دێنێ و ماریا پترۆڤنا بۆخۆی دێت و دەرگای لێ دەکاتەوە.

مارا پترۆڤنا جگە لە کراسە سپیەکەی، باڵتۆیەکی پیاوانەشی بە شانیدا داوە و چرایەکی بچووکی بەدەستەوەیە، گڕی ڕەنگ سەوزی چراکە، ڕوناکاییەکی مەیلەوسەوز بەسەر ڕوخسارە خالاّوی و خەوالّوەکەی , گەردەن و ملە پڕ لە دەمار و گۆشتنەکەی و بەسەر قژە زەرد و تەنکەکەیەوە کە لەژێر چارشێوەکەیەوە دیارە، پەخش دەکا. کابرای بالاّبەرز دەپرسێ:

- خاتونی مامان لەماڵە؟

- خۆمم. فەرمایشتێکت هەبوو؟

کابرا، دەچێتە هاڵی ئاپارتمانەکەوە. ماریا پترۆڤنا، خۆی لە بەرامبەر کابرایەکی بالاّبەرز و ڕێك و تەمەن مامناوەندیدا دەبینێ کە ڕوخسارێکی جدیی و جوانی هەیە. کابرا دەڵێ:

- بەندە کیریاکۆڤ، کارمەندی پلە پێنجی دەوڵەتم. هاتوومە خزمەتتان تا فریای ژنەکەم بکەوی. تکایە پەلە بکە.



- زۆر باشە ... ئێستا ئامادە دەبم ... تکایە لە ژووری میوانان چاوەڕوانم بە.

کیریاکۆڤ، باڵتۆکەی دادەنێ و دەچێتە ژووری میوانان. تیشکی ڕەنگ سەوز و بێ تینی چرا بچووکەکە ، بەسەر مۆبڵە هەرزانبەهاکان - کە سەرچەفی سپییان پێداداون - و بەسەر گوڵە ژاکاوەکان و بەسەر گەڵای ئەو لاولاوەوە کە خۆی لە چووارچێوەی دەرگاکە ئالاّندوە، دەدرەوشێتەوە ... ژووری میوانان بۆنی گوڵ و ئەسیدفنیکی لێ دێ. دەمژمێرە دیواریە بچووکەکە، گۆشەگیرانە - وەك ئەوەی بەهۆی بوونی کەسێکی بێگانەوە شەرم بکا - چرکە چرکی دێ.

پێنج خولەك دواتر ماریا پترۆڤنا - کە ئێستا ئاوێکی بە ڕوخساریدا کردووە و لیباسەکانی گۆڕیون - گورج و شادمانانە خۆی بە ژووری میوانان دا دەکا و دەڵێ:

- من ئامادەم! فەرموو با بڕۆین!

- بەڵێ، بەڵێ ... دەبێ پەلە بکەین ... وە هەروەها دەمەوێ پرسیارێکیشت لێ بکەم هیوادارم بە ناڕەوا و نابەجێی نەزانیت: هەقی هاتنت چەندم لێ وەردەگری؟

ماریا پترۆڤنا هەست بە شەرم دەکا و وەلاّم دەداتەوە:

- ڕاستیەکەی نازانم ... چەندت پێ باش بوو ئەوەندەم بدەرێ ...

کیریاکۆڤ نیگایەکی سارد و مۆلەق دەبڕێتە مامان و دەڵێ:

- نا! من حەز بە شتی وا ناکەم. مامڵە لە خودی پارەکەش باشترە. نە من چاوم بڕیوەتە ماڵی تۆ، نە تۆش پێویستیت بە ماڵی منە. بۆ پێشگرتن لە هەر جۆرە تێك نەگەیشتنێکی دوایی، ئاوەزی دروست وا بڕیار دەدا جەنابت لەپێشەوە هەقی هاتنی خۆتم پێ بڵێیت.

- ڕاستیەکەی نازانم ... ڕوون نییە ...

- سەیرکە من خۆم مرۆڤێکی زەحمەتکێشم و ئامادەم نرخ بۆ ماندوبوونی خەڵکانی تریش دابنێم. لە لایەکی تریشەوە حەز ناکەم ویژدانم بخەمە ژێر پێوە. ئەگەر لە هەقی خۆت کەمترت بدەمێ، یان تۆ لە هەقی خۆت زیاترم لێ وەرگریت ئەوا لە هەردوو حاڵەتەکەدا بە هەمان ئەندازە نائاسودە دەبم، هۆکاری ئەو سوربوون پێداگریەشم هەرئەوەیە و بۆیە دەمەوێ پێشەکی هەقی هاتنی خۆتم پێبلێی.

- ئاخر خۆ نرخەکان هەموو جارێ وەك یەك نین! پەیوەندی بە ...

- هم! ... کەوابێ بۆ نەمانی ئەو دودڵییەت - کە نازانم لە چیەوە سەرچاوەی گرتوە - ناچارم خۆم هەقی هاتنەکەت بڵێم. بە نیازم دوو ڕۆبڵت بدەمێ.

ماریا پترۆڤنا سوور هەڵدەگەڕێ و هەندێك دەچێتە دواوە و وەڵام دەداتەوە:

- ئیختیارت هەیە کاکە! تەنانەت بە بیستنی ئەو برە پارەیەی کە گوتت شەرم دامدەگرێ ... ئەگەر بڕیار بێ دوو ڕۆبڵت لێ وەرگرم، ئەوا ئامادەم بە خۆڕایی بێم. پێنج ڕۆبڵت لێ وەردەگرم ...

- لە دوو ڕۆبڵ زیاتر نادەم. چاوی تەماحم نەبڕیوەتە ماڵی تۆ بەڵام ئامادەش نیم پارەی زیاد بدەمە هیچ کەسێك.

- هەرچۆنێك کە پێت باشە، بەڵام من بە دوو ڕۆبڵ مامانیی ناکەم ...

- بەڵام بەپێی یاسا مافی ئەوەت نییە بە هانای ژنانەوە نەچی.

- کەوایە لێمگەڕێ و پارەم لێت ناوێ.

- من پێویستیم بە یارمەتیی و هاوکاریی خۆڕایی و بەلاشی کەس نییە. دەبێ هەقدەست لەبری کردنی هەر کارێك بدرێ. لە بەر ئەوەی خۆم مرۆڤێکی زەحمەتکێشم ، زۆرباش درك بەم شتانە دەکەم ...

ماریا پترۆڤنا بە دەنگێکی لەبارەوە دەڵێ:

- منیش ئامادەنیم دوو ڕۆبڵ وەرگرم ... لێمگەڕێ و هیچم ناوێت ...



- کەوایە ببوورە! بوومە هۆی نائاسودەییتان ... شەو شاد!

خاتونی مامان لەکاتێکدا کە کابرا بەرەو هاڵەکە ڕێنمایی دەکا، دەڵێ:

- تۆ مرۆڤێکی سەیری ... ئێستا کە ئەوەندە مکوڕی ئامادەم تەنیا سێ ڕۆبڵت لێ وەرگرم.

کیریاکۆڤ ڕوخساری تێك دەنێ، چاو دەبڕێتە زەوی، لەفکران ڕادەچێ و نزیکەی دوو خولەك بێدەنگ دەبێ و دواتر بەشێوەیەکی بنبڕانە دەڵێ:

- (( نا ! )) و پاشان وەدەردەکەوێ و دەچێتە کۆڵانێ.

خاتونی مامانیش بە هەستکردن بەشەرم و تاسانەوە، دەرگاکە لەدوایەوە دادەخا و دەچێتەوە ژووری نووستنەکەی و بەرلەوەی بچێتە نێو جێگاکەیەوە بیردەکاتەوە:

(( چەندە پیاوێکی قیافە ڕێك و بەهێز و لە هەمان کاتیشدا چ بوونەوەرێکی سەیر و نامۆ بوو! ... )).

بەڵام نیو دەمژمێر بەسەر ئەم ڕوداوە دا ڕانابرێ کە جارێکی تر زەنگی دەرگا دێتەوە بەرگوێ. ماریا پترۆڤنا دەچێ دەرگا دەکاتەوە و دیسانەوە هەمان کیریاکۆڤ لەبەرامبەر خۆی دا دەبینێتەوە. کابرا دەڵێ:

- ئای لەو هەموو بێسەرەوەبەرەیی و بەرەڵاییە! هەوڵمدا ناونیشانی مامانەلی تر لە دەرمانخانە و پاسەوان و تەنانەت ئێشکچیەکانیش وەرگرم بەڵام هیچ کەس نەیتوانی هاوکاریم بکات، بۆیە کەوتومەتە دۆخێکەوە ناچارم مەرجەکانت قبووڵ بکەم. زۆرباشە، سێ ڕۆبڵ دەدەم بەڵام ... بەڵام لەئێستاوە لەحاڵەتی داواکردنیی خزمەتکار یان بەشێوەیەکی گشتیی لە حاڵەتی کەڵك وەرگرتن لە یارمەتی هەرکەسێك، وا باشترە لە پێشەوە بیبڕێنمەوە: هیچ هەواڵێك لە وەرگرتنی زیادەکاریی و خەڵات و شتی لەم جۆرە نییە. هەرکەسە و دەبێ بە گوێرەی ماندوبوونی خۆی پارە وەرگرێ، نەك زیاتر.

ماریا پترۆڤنا ئیدی توانای گوێگرتنی وتارەکانی ئەوی نەماوە، هەست دەکات بەدەست ئەم پیاوەوە گیری خواردوە، بێزارە، هەست دەکا خەریکە قسە بەکێش و سەرواکانی کابرا قورسایی لەسەر گیانی دادەنێن. دواتر لیباسەکانی لەبەردەکات و وێکرا لەگەڵ کیریاکۆڤدا وەدەردەکەون.

کەشوهەوا ئارام و لەهەمان کاتدا هەور بەشێوەیەك ئاسمانی گرتوە کە چرای شەقامەکان بە ئاستەم دەبینرێن. قوڕوچڵکاو لەژێر قاچەکانیان دا فلقەفلێتی.

خاتونی مامان سەیرێکی دەوروبەری خۆی دەکا و هیچ درێشکەیەکی بەرچاو ناکەوێ ... دەپرسێ:

- ماڵتان لەم نزیکانەیە؟

- دوور نییە.

کۆلانێك و دوان و سیان تێدەپەڕێنن ... کیریاکۆڤ بەشێوەیەك هەنگاو دەنێ کە بە ئاشکرا هێز و ویقاری تێدا بەدی دەکرێ. مامانەکە بێدەنگی دەشکێنێ و دەڵێ:

- چ هەوایەکی خراپی هەیە!

بەڵام کابرا ژیرانە درێژە بە بێدەنگیی خۆی دەدا و پێوەی دیارە کە هەوڵ دەدا لەکاتی ڕۆیشتنندا قاچەکانی بخاتە سەر بەردە تەختەکان تا پێڵاوەکانی نەسوێن و خراپ نەبن. سەرەنجام دوای ڕێگابڕینێکی درێژ، ماریا پترۆڤنا دەگاتە ناو حەوشە سەر داپۆشراوەکەی ماڵی کیریاکۆڤ. لەنێو حەوشە سەرداپۆشراوەکەوە سالۆنە پێشوازیە گەورەکەیان دەبینێ کە بە کەلوپەلی باش، پڕکراوەتەوە. لە ژوورەکاندا - تەنانەت لە ژووری ژنەی ژانگرتوشدا - گوێت لە چرکەیەك نابێ.

لێرە هیچ هەواڵێك نییە لە خڕبوونەوەی خزم و خوێش و ئەو پیرەژنانەی لە ژنی ژانگرتو کۆدەبنەوە. تەنیا خزمەتکاری ماڵ نەبێ کە بە قیافەیەکی ترساو و



خاڵیی لە درك کردن بە دۆخەکە، شێتانە بەملاولادا هاتوچۆیەتی. دەنگی ئاخ و ناڵەیەك دێتە بەرگوێ.

نزیکەی سێ دەمژمێر ڕادەبرێ. ماریا پترۆڤنا بەتەنیشت چارپای ژنەوە دانیشتوە و خەریکی سرتە و چرپەیە لەگەڵی. ئەوان توانیویانە لەو ماوە کورتەدا لە گەڵ یەکتر ببنە ئاشنا، یەکتر بناسن و لە پاشملە هەندێك لەبارەی خەڵکانی ترەوە بدوێن و بکەونە دەردەدڵ ... ماریا پترۆڤنا بە نیگەرانییەوە دەڵێ:

- تۆ نابێ قسە بکەیت.

خۆشی پەیتا پەیتا ژنەی ژانگرتوو دەداتە بەر پرسیاران.

سەرەنجام دەرگای ژووری نووستن دەکرێتەوە و کیریاکۆڤ بە ئارامی و سەنگینییەوە وەژوور دەکەوێ. لەسەر کورسییەك دادەنیشێ و دەستێك بە موەکانی پشتە سەری خۆیدا دێنێ. بێدەنگیی حوکمڕانە ... ماریا پترۆڤنا بە نیگایەکی تێکەڵ بە شەرمەوە لە ڕوخساری جوان و بێباکانە و تەختەئاسای کیریاکۆڤ دەڕوانێ و لە چاوەڕوانیی ئەوەی کە بەڵکوو سەری قسان بکاتەوە، درێژە بە بێدەنگیی خۆی دەدا. بەڵام کیریاکۆڤ هەروا بێدەنگە و لەفکران ڕاچووە. ماریا پترۆڤنا کە چیدی توانای دان بەخۆداگرتنی نەماوە بەو مەبەستەی کە قسەیەکی کردبێ و بتوانێ قسەوباسێك بێنێتە گۆڕێ، دەڵێ:

- سوپاس بۆ خودا کە کەسێکی تریش هاتە سەر ژمارەی خەڵکانی سەر زەوی.

کیریاکۆڤ کە حاڵەتی وشك و تەختەئاسای ڕوخساری تا ئەو کاتە پاراستوە ، وەڵام دەداتەوە:

- بەڵێ پێوقەدەمی بەخێرە ... بەڵام منداڵی زیاتر پارەی زیاتریشی دەوێ. منداڵ کە لەدایك دەبێ نە زگی تێرە، نە جلوبەرگیشی لەبەردایە.

نیشانەیەك لە هەستکردن بە گوناه بەسەر ڕوخساری ژنەی زەیستانەوە نەخش دەبەستێ، وەك ئەوەی کە بوونەوەرێکی بەبێ وەدەسهێنانی ڕەزامەندیی، یان هەر بە هەواو هەوەسێکی گەمژانە هێنابێتە ژیانەوە. کریاکۆڤ ئاهێك هەڵدەکێشێ و هەڵدەستێ و دەچێتە دەرێ.
ماریا پترۆڤنا ڕوودەکاتە ژنەی زەیستان و دەڵێ:
- مێردێکی سەیرت هەیە ... هەمیشە سەختگیر و گرژ و مۆن ... خۆ زەردەخەنەیەك ناکا ...
ژنە وەلاّم دەداتەوە کە ئەو هەمیشە هەروایە ... مرۆڤێکی سەرڕاست و دروستکار و بەویژدان و بەهەست و مەنتیقییانە دەسپێوەگرە بەلاّم هەمو ئەم ئاکارە باش و پەسندانە بە شێوەیەکی هێندە ناشییانە پەیڕەو دەکا مرۆڤ وەگیان دێنێ. خزمەکانی هەموو پەیوەندیان لەگەڵدا پچڕاندوە، هەر خزمەتکارێك دێنین لە مانگێك زیاتر خۆی لامان ناگرێ و لە دەستی هەڵدێن، چی دۆست و ئاشنا هەیە خۆی لێ دوور دەگرن، ژن و منداڵەکانی لە ترسی ئەوەی نەکا ڕقیان لێ هەڵگرێ بەردەوام لە ترس و لەرز دا دەژین. ئەو نە دەیکاتە دەنگەدەنگ، نە دەیکاتە هۆسە و هاتوهاوار، کردارە باشەکانی چەندجاران زیاترن لە کردارە خراپەکانی. هەرکە لە دەرگای حەوشە دەچێتە دەرێ هەموان ئاهێکی ئاسودە هەڵدەکێشن. خودی ژنەی زەیستانیش سەری لە خو و ڕەوشتی مێردەکەی دەرناچێ.
لەم کاتەدا کیریاکۆڤ وەژوور دەکەوێ و دەڵێ:
- دەبێ هەموو قاپەکان بشۆن و بیانبەنەوە عەمبارەکە. ئەو شوشە دەرمانە بەتاڵانە نابێ فڕێ بدرێن، لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەکەڵك بێن.
زۆر سادە و ئاسایی دەدوێ بەلاّم خاتونی مامان - کە ڕوون نییە بەهۆی چیەوەیە - دەتاسێ و شپرزە دەبێ. وردە وردە ترس لەم پیاوە دایدەگرێ و هەرکە



گوێی لەدەنگی پێی دەبێ ڕادەچڵەکێ. سبەی کاتێ ئامادە دەبێ بۆ ڕۆیشتنەوە منالّە چکۆلەکەی کیریاکۆڤ دەبینێ - منالّێکی لە تەمەنی خوێندنی سەرەتایی، قژ کورت و ڕەنگ پەڕیوو - کە لە ژووری نانخواردندا دانیشتوە و سەرگەرمی خواردنی نانی بەیانییە ... کیریاکۆڤ دەچێتە بەرامبەر منالّەکە و ڕادەوەستێ و بە دەنگێکی لەبار و هاوسەنگەوە دەڵێ:
- تۆ کە دەزانی نان بخۆی دەبێ بشزانی کار بکەی! بۆ نموونە ئێستا نازانی ئەو چایەی کە ئێستا خەریکی دەیخۆیەوە چەند پارەی تێچووە و بە چ حالّێك پەیدا کراوە ... نانەکەت بخۆ و باش بیر لەو قسانەم بکەرەوە ...
ماریا پترۆڤنا چاو دەبڕێتە ڕوخساری مەنگ و گێژی کوڕێژگەکە، وا هەست دەکا هەوای نێو ژوورەکەش هەست بە قورسایی دەکا لە داخی ئەم پیاوە. وا گوومان دەکا ئێستا نا ئێستا دیوارەکانیش لە داخی ئەم پیاوە نائاساییە توانای دان بەخۆداگرتنیان نامێنی و دادەڕمێن. دواتر، گێژانە، لە ترسان و لە هەستکردن بە ڕقێکی توندەوە، دەکەوێتە کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانی و بەپەلە دەچێتە دەرێ.
لە ڕێگادا هەستدەکا بیری چووە سێ ڕۆبڵی هەقدەستەکەی خۆی وەرگرێ بەلاّم دوای کەمێك بیرکردنەوە چاو لە خێری ئەو پارەیەش دەپۆشێ و درێژە بە ڕێگای خۆی دەدا.

# ئـــا غـا ذ ن

## 1

**گالیسکەیەك کە جوتێك ئەسپی چووست و گورجی لای ( ڤیاتکا ) یان لێ بەستبوو، بە خشەخش بەسەر پوشە و پەلاشە تۆزلێنیشتوەکان دا تێپەڕی و لەبەردەم کوختەخانوەکەی ( ژۆرکین ) دا ڕاوەستا.**

**( سترێلکۆڤا ) ی ئاغاژن و ( فلێکس ئادامۆڤیچ ڕژۆتسکی ) سەرپەرشتیاری، لە گالیسکەکەدا دانیشتبوون. سەرپەرشتیارەکەی ئاغاژن بە چووستی لە گالیسکەکە دابەزی، بەرەو کوختە ڕۆیشت و بە پەنجەی شادەی چەند جارێك لە شوشەی پەنجەرەکەی دا. لەودیوەوە دەنگی پیرەژنێك هاتەبەرگوێ:**

**- کێیە؟**

**وە لەهەمان کاتدا سەری ( ماکسیم ) لە پشت پەنجەرەکەوە دەرکەوت. ئاغاژن هاواری کرد:**

**- نەنە وەرە دەرێ!**

**خولەکێك دواتر ماکسیم و پیرەژنەکەی هاوسەری لە کوختەخانوەکە هاتنە دەرێ، لە تەنیشت دەرگاکەوە ڕاوەستان و بێ ئەوەی ورتەیان لە زاری بێتە دەرێ سەرەتا ڕوو بە خانم و پاشان ڕوو بە ڕژۆتسکی سەرپەرشتیار، سەریان دانەواند.**

**ێلینا یگۆرۆڤنا ڕووی کردە ماکسیمی پیر و پرسی:**

**- تکایە پێمبڵێ: ئەم کارانە چین؟**

**- بۆ چی بووە؟**



**- بۆ نازانی؟ ستیپان لە ماڵە؟**

**- نەخێر قوربان. چۆتە ئاشی.**

**- هیچ سەر لە کارەکانی ئەم پیاوە دەرناکەم! دەیەوێ بەم کارانە چ بڵێ؟ بۆچی لای من ڕۆیشت؟**

**- ئێمە ئاگامان لە هیچ نییە خاتون. ئێمە چووزانین؟**

**- ڕەفتارێکی زۆر ناشیرین بوو! ڕۆیشت و منی بێ گالیسکەڕان بەجێهێشت! ئێستا بەهۆی ئەوەوە فلێکس ئادامۆڤیچ ناچارە ئەسپەکان لە گالیسکەکە ببەستێ و ببێتە گالیسکەڕان. سەرەنجام تۆش دەبێ بزانیت کە ئەوە کارێکی گەمژانەیە! دەبێ مانگانەکەی پێ کەم نەبووبێ؟**

**پیرەمێردەکە لەحاڵێکدا کە لەژێروە دەیڕوانییە فلێکسی سەرپەرشتیار کە خەریکبوو لە پەنجەرەکانەوە سەیری ژورێی دەکرد، وەلامی دایەوە:**

**- خوا دەزانێ! خۆ قەت هیچمان پێ ناڵێ، هیچ ئاگامان لە شتەکانی نییە! دەڵێ: وازمهێنا! خۆم چیم پێ باش بێت ئەوە دەکەم! وا هەست دەکەم مانگانەکەی پێ کەم بووبێ!**

**فلێکس ئادامۆڤیچ سەیرێکی پەنجەرەکەی کرد و پرسی:**

**- ئەی ئەوە کێیە لەوێ!، کێیە لە ژێر شەمایلەکە، لە سەر ئەو نیمکێتە نوستوە؟**

**- ئەوە سیمیۆنە بابەگیان! ستیپان چۆتە ئاشی.**

**خاتون جگەرەیەکی داگیرساند و بەدەم مژلێدانەوە درێژەیدایە:**

**- ڕەفتارێکی زۆر چاوقایمانە بوو! ئەرێ مسیۆ ڕژۆتسکی، ستیپان چەندی وەردەگرت؟**

**- مانگی دە ڕۆبڵ.**

- ئەگەر دە ڕۆبڵی پێ کەم بوو دەمتوانی بۆی بکەمە پانزە ڕۆبڵ! بەڵام بێ ئەوەی یەك قسە بکا لێیدا ڕۆیشت. توخوا ئەمە کارێکی شەرفمەندانەیە؟ توخوا ئەمە ڕەوایە؟

ڕژۆتسکی کە هەوڵی دەدا بەر لە کۆتایی قسەکانی پشتئەستور نەبێ بە جنێوەکانی، گووتی:

- مەگەر پێم نەگوتی ئەمانە بەکەڵکی ئەوە نایەن چاودێری و دڵنەوایی بکرێن؟ تۆ زۆرت ڕو دایە ئەم مفتەخۆرانە! نابێ هیچ کات ئەم کرمانە مانگانەکەیان بە تەواویی بدرێتێ! لەبەرچی؟ بۆچی مانگانەکەی بۆ زیاد دەکەیت؟ زیادیشی نەکەیت دەبێ بگەڕێتەوە! ڕێکەوتن کراوە، خۆ گاڵتە نییە!

پاشان ڕوی کردە ماکسیم و درێژەیدایە:

- پێی بڵێ بەو بەرازە!

خاتون ڕوو بە ڕژۆتسکی گوتی:

- ( finissez donc! *)

ڕژۆتسکی هەروا بەردەوام بوو:

- گوێت لێیە لادێیی؟ کاتێ لە شوێنێك وەرگیرای دەبێ کاریش بکەی شەیتان، نەك هەرکاتێ حەزت لێ نەما وازبێنی و بڕۆی! ئەم کەللەڕەقیی و سەرەڕۆییانەی نیشان دەدەم! ئێوەش خراپتان چاو پێدەکەوێ! گوێت لێیە پیرەژن؟

- finissez ڕژۆتسکی!

- خراپتان چاو پێدەکەوێ! ئیدی پێ نەخەیتەوە نێو نوسینگەکەی من پیرەسەگ! ئیدی ڕوتان بدەمێ؟ بۆ ئێوە مرۆڤن؟ بۆ قسەی باشتان بە مێشکدا دەچێ؟ بەس زللە چارەتان دەکا! پێی بڵێ با بەیانی بێتەوە سەر کارەکەی!

- بەچاوان! بۆچی پێی نەڵێم! دەکرێ بگوترێ کە ...

ێلینا یگۆرۆڤنا گووتی:



- پێی بڵێ مانگانەکەی بۆ زیاد دەکەم. خۆ من بێ گالیسکەڕان هیچ کارێکم بۆ ناکرێ! هەرکاتێ گالیسکەڕانێکی ترم دەسکەوت ئەوسا ئەگەر حەزیکرد دەتوانێ بڕوا. دەبێ حەتمەن سبەی بەیانی بێتەوە لای من! پێشی بڵێ لەو ڕەفتارە ناشیرنانەی ڕەنجاوم! نەنە تۆش ئەم قسانەی منی پێ بڵێ! هیوادارم کارێك نەکا پیاوی بەدوادا بنێرم! وەرە پێش نەنە! ئەمە بۆ تۆ ئەزیزم! پێدەچێ بەدەست ئەم منداڵە پوچانەوە گیرت خواردبێ؟ ها بگرە ئەزیزم!

خاتون قوتوە جگەرەیەکی جوانی لە گیرفانی دەرهێنا و لەژێر جگەرەکانەوە پارەیەکی کاغەزی مەیلەو زەردی دەرهێنا، دایەدەستی پیرەژنەکە و لێی زیاد کرد:

- ئەگەر نەیەتەوە ناچارم بە پێچەوانەی حەزی خۆمەوە ڕەفتار بکەم، لێی قبوڵ ناکەم ... بەڵام ئومێدەوارم کە ... تۆ ئامۆژگاریی بکەیت. دەی فلێکس ئەدامۆڤیج وەرێکەوە! خواحافیز!

ڕژۆتسکی خۆی هەڵدایە ناو گالیسکەکە، هەوسارەکانی بەدەستەوە گرتن و گالیسکەکەی بەنێو زەوییە نەرم و هەموارەکەدا خستە ڕێ.

پیرەمێردەکە پرسی:

- چەند پارەی دا پێت؟

- یەك ڕۆبڵ.

- بێنە بمدەرێ!

پیرەمێرد، پارە کاغەزە یەك ڕۆبڵییەکەی وەرگرت و بەرلەوەی بە جوانی بینوشتێنێتەوە و بیخاتە گیرفانییەوە بە ناولەپی دا هێنا و بەدەم چوونە نێو کوختەکەوە گوتی:

- ستیپان، ڕۆیشت! درۆم کرد و پێمگوت چوویە ئاشی. بەتەواوی ترسی لێ نیشتوە! ...

هەرکە گالیسکەکە ڕۆیشت و لەچاوان ون بوو سەروکەللەی ستیپان لە پشت پەنجەرەکەوە دەرکەوت، بە ترس و لەرز و ڕەنگێکی پەڕیوی چەشنی مردوانەوە، نیوەی جەستەی لە پەنجەرەکەوە دەرهێنا و ڕوو بەو باخچەیەی - کە تا دەهات زیاتر ڕۆدەچووە نێو تاریکایی شەوەوە - دەستی کرد بە جنێودان. باخچەکە هی ئاغا بوو. دوای ئەوەی کە شەش جاران ڕوو بە باخچەکە جنێوی دا، بەدەم پرتەوبۆڵەوە گەڕایەوە نێو کوختەکە و کشایەوە و کڕکڕەی پەنجەرەکەی دادایەوە.

نیو دەمژمێر دوای ڕۆیشتنی ئاغاژن،ماڵی ژۆرکین دانیشتنە سەر نانخواردن.

ژۆرکین و ژنەکەی دروست لە تەنیشت زۆپاکە، لەسەر مێزێکی پیس دانیشتبوون. سیمیۆن، واتا کوڕە گەورەکەی ماکسیم کە بە شێوەیەکی کاتیی لە خزمەتی سەربازی مەرەخەس کرابوو، بەڕوخسارێکی سور و ئارەقاویی و لوتێکی زلی زیپکاوی و چاوانی گچکەیەوە لەبەرامبەریان دانیشتبوو. قیافەی لە قیافەی بابی دەچوو تەنیا ئەوە نەبێ کە سەری نەتاشرابوو و موەکانیشی سپی نەببوون، چاوەکانیشی هیچ چەشنە وێکچوونێکیان دەگەڵ چاوە فێلاوی و دۆمانەکانی ماکسیمی بابی نەبوو.

ستیپان، واتا کوڕەکەی تری ماکسیم لە تەنیشت سیمیۆنەوە دانیشتبوو، دەمی لە خواردنەکە نەدەدا دەستەکانی چەشنی کۆڵەکەیەك نابووە بەر سەروپرچە ڕەنگ کاڵەکەی، چاوی بڕیبووە ساپیتە دوکەڵگرتوەکەی کوختەکە و بە قوڵی لە فکران ڕاچووبوو و بەجدی بیری لە شتێك دەکردەوە. ماریای ژنی ستیپان بە کارەکانی سەرسفرەکە ڕادەگەیی. ئاش کەلەمەکە لە بێدەنگییەکی تەواودا خورا.

هەرکە لە نانخواردن بوونەوە، ماکسیم ڕوو بە ماریا گووتی:

- وەرە کۆیکەرەوە!



ماریا کاسە و قاپە بەتاڵەکانی لەسەر مێزەکە هەڵگرتن و گەرچی نێوانێکی ئەوتۆی دەگەڵ زۆپاکە نەبوو کەچی نەیتوانی دەفر و قاپەکان بە سەلامەتی بگەیەنێتە لای زۆپاکە، چەند جارێك لەتری دا و کەوتە سەر نیمکێتەکە، قاپە ئاشەکەی لەدەست بەربۆوە بەسەر ئەژنۆکانیدا سەرانگرێ بوو، کەوتە سەر زەوی. دەنگی پڕمەپڕمی گریانی بەنێو هەوای کوختەکەدا بلاو بۆوە.

ماکسیم پرسی:

- دەڵێی کەسێك دەگری؟

ماریا بە دەنگێکی بەرزتر دەستی بە گریان کرد. دو خولەکێك تێپەڕی، سەرەنجام پیرەژن هەستا و مەنجەڵێك ساوەری خستە سەر مێزەکە. ستیپان کۆخەیەکی کرد ، لەسەر مێزەکە هەستا و لەژێر لێوەوە بە پرتە و بۆڵەوە گوتی:

- بێدەنگبە!

- ماریا هەروا دەگریا. ستیپان هاواری کرد :

- پێت دەڵێم بێدەنگبە!

سیمیۆن لە حاڵێکدا کە پشتەملە زبرەکەی خۆی دەخوراند، نەترسانە گووتی:

- زۆر ڕقم لە گریانی ژنانە! خۆشی نازانی بۆچی ئاوا هاواری لێ بەرز بۆتەوە! لەخۆڕا نییە کە دەڵێن ژنان! واباشترە ئەو هاتوهاوار و شاتەشاتە بباتە حەوشێ!

ماکسیم لەوەلامییدا گوتی:

- فرمێسکی ژن وەك دلۆپەئاوە! چانییە بە پارە نییە. ئەو هاوار و گریانەت لەچیە؟ بەسە وازبێنە! ستیپانت لێ ناستێنن! وەی چەند دڵی ناسك بووە! کچۆڵەی ناسك و نازدار! دەی هەستە ساوەرەکەت هەڵقوڕێنە!

ستیپان بەرەو لای ماریا داچەمیەوە و کوتای بە ئانیشکی دا و گووتی:

- چیتە؟ بەسە! مەگەر گوێت لێ نییە! بەسە وازبێنە چەپەڵ!

ئەمەی گوت و مستی بەرزکردەوە و کێشای بەو نیمکێتەدا کە ماریای لەسەر
ڕاکشابوو. دڵۆپە فرمێسکێکی گەورە و درەوشاوە لە چاوی تکا و بەسەر
گۆنایدا هاتەخوار، فرمێسکەکەی سەرگۆنای سڕیەوە و گەڕایەوە سەر مێزەکە و
کەوتە خواردنی ساوەرە بێ ڕۆنەکە. ماریاش هەستا و بە هۆقەهۆقی گریانەوە
چووە پشت زۆپاکە. هەرکە ساوەرەکەیان خوارد پیرەمێرد هاواری کرد:

- ماریا! کڤاس بێنە! ژنی گەنج دەبێ خۆی کاری خۆی بزانێ! شین و گریان
کارێکی جوان نییە! خۆ منداڵ نیت!

ماریا بە ڕوخساری ڕەنگ پێوە نەماو و فرمێسکاویەوە لە پشت زۆپاکە هاتە
دەرێ و بێ ئەوەی سەیری کەس بکا کەوچکێکی زلی دارینی پڕ لە کڤاسی دایە
دەستی خەزوری. کەوچکەکە دەست بە دەست گەڕا. سیمیۆن کەوچکەکەی
وەرگرت، خاچێکی لە سەر سینگی خۆی کێشا، هەندێك کڤاسی خواردەوە و
کەوتە کۆخەکۆخ.

- بەچی پێدەکەنی؟

- هیچ ... هەروا. شتێکی پێکەنیناویم بیرکەوتەوە.

سیمیۆن کەمێك سەری خۆی کێشایە دواوە و دەمە گەورەکەی کردەوە و
سەیرێکی ستیپانی کرد و زەردەخەنەیەکی تەوساوی کرد و پرسی:

- ئەوە خاتون بۆ هاتبووە ئێرە؟ ها؟ دەیگوت چی؟ هە - هە - هە!

ستیپان ڕوانییە سیمیۆن و وەك چەوەندەر سور هەڵگەڕا. پیرەمێرد پرسی:

- پانزە لیرە دێنێ.

- سەیرە! کوڕە وەڵا سەدیش دێنێ بەخودا دەیهێنێ!

سیمیۆن چاوێکی هەڵتەکاند و هەندێك خۆی کێشایەوە و گوتی:

- ئای خۆزگە ژنێکی ئاوا دەست من دەکەوت! چۆن کەفوکوڵێم دادەمرکاندەوە!



پاشان ماسولکەکانی تێك ترنجاند و مستێکی کێشا بە شانی ستیپان دا و
درێژەی پێدا:

- بەڵێ گیانەکەم! تۆ زۆر شەرمنی! ئێمە نابێ شەرمن بین! تۆ گەمژەی
ستیپان! بەڕاستی زۆر گەمژەی! باوکیشی گوتی:

- ڕونە کە گەمژەیە!

جارێکی تریش دەنگی هۆقەهۆقی گریان بەرز بۆوە.

- دیسانەوە ژنەکەت دەستی بە زۆڕەزۆڕ کردەوە! پێدەچێ زۆر بەخیل بێ! من
زۆر ڕقم لە زۆڕە زۆڕ و فینگەفینگی ژنانە، غژەغژی چەقوم بیردەخاتەوە! ئامان
لە دەست ژنان! ئاخر چ پێویستی دەکرد خودا ئێوە بخولقێنێ؟ کاکینە سوپاس
بۆ نانی ئێوارێتان، ئێستا دڵم شەرابی دەوێ تا خەونی خۆش ببینم! پێدەچێ
ئاغاژنەکەت لەم شەرابانەی زۆر هەبێ!

- سیمیۆن بەڕاستی ئاژەڵێکی بێ هەستیت!

ئەمەی گوت و ئاهێکی هەڵکێشا و پارچە کەولێکی نایە بن هەنگڵی و چووە
نێو حەوشێ. سیمیۆنیش بەدوای ویدا هات.

هەوای شەوانی هاوینی ڕوسیا، ئارام بێ دەنگ بەسەر هەوای حەوشەدا زاڵ بوو.
مانگ لە پشت گردۆڵکە دورەدەستەکانەوە بەرەو ئاسمان ڕێگای دەبڕی. هەورە
پچڕپچڕ و کەنارسپییەکان بەرەو پێشوازی کردن لە مانگ لە مەلە دا بوون.
ئاسۆ ڕەنگی گۆڕا و سەرتاسەری پانتاییەکەشی مەیلەوسەوز هەڵگەڕا.
ئەستێرەکان، وەك ئەوەی لە مانگ ترسابن، ڕوناکییە کزەکەیان کێشابۆوە نێو
خۆیان و ڕەنگپەڕیو و کوێرانە، دەجریوانەوە. لەلای ڕوبارەکەوە شێیەکی شەوانە
و ڕوخسارلاوێن، بە هەمو لایەکدا بلاَو ببۆوە. نۆ جاران دەنگی زەنگی
کاتژمێرە چەڵەمەدارە دیوارییەکەی باوکە گریگۆری لە سەرتاسەری ئاوایی
دەنگی دایەوە. مەیخانەچییە یەهودیەکە پەنجەرەکانی مەیخانەکەی بە

دەنگەدەنگێکی زۆرەوە داخست و فانۆسێکی ڕەشداگەڕاویشی بە سەروی دەرگای چوونەژوورەوەدا هەڵواسی. لەنێو کۆڵان و حەوشەکانیشدا یەك کەست بەرچاو نەدەکەوت ... ستیپان کەوڵەکەی لەسەر زەویەکە ڕاخست، خاچێکی لە سەر سینگی کێشا و مەچەکی خستە ژێر سەری و ڕاکشا. سیمیۆنیش کۆخەیەکی کرد، لە خوار قاچی ئەوەوە دانیشت و گوتی:

- بەڵێ ...

پاشان، دوای ماوەیەك بێدەنگیی، ئاسودەتر دانیشت و پایپەکەی ئامادە کرد و درێژەی پێدا:

- ئەمڕۆ چوومە لای ترۆفیم ... سێ بتڵ بیرەم خواردەوە. ستیپانی برام حەزناکەی مژێك لەم پایپە بدەی؟

- نا، حەزم لێ نییە.

- توتنێکی چاکە. ئای بۆ پیاڵەچایەك! پێمبڵێ بزانم تا ئێستا چات لای ئەو خاتونە خواردۆتەوە؟ دڵنیام چای چاکی هەیە، وانییە؟ لەوانەیە چارەکی پێنج ڕۆبڵ بێنێ. چای هەیە چارەکی سەد ڕۆبڵیش دێنێ. بەخوا هەیە. ڕاستە خۆم نەمخواردۆتەوە بەڵام دەزانم هەیە. ئەوکاتەی لە شار لە موغازە کارم دەکرد بە چاوی خۆم دیتم ... ژنێکی دەوڵەمەند هاتە موغازەکە و چای سەد ڕۆبڵیی کڕی ... بۆنی مرۆڤی شێت دەکرد! من بەس بۆنم دەکرد. وەرە سبەی با بچینە لای خانم.

- وازم لێ بێنە!

- چیە بۆ تورە بووی؟ خۆ جنێوم پێنەداوی تەنیا قسەم لەگەڵ کردوی. بۆچی وا تورە بوویت! بۆچی ناتەوێ بچیەوە لای خاتون هەی گەمژە؟ هیچ سەر لەمە دەرناکەم! هەم پارەی باشت دەداتێ، هەم خوردوخۆراك ... هەرچی حەزت لێیە دەتوانی بیخۆی ... دەتوانی لە جگەرەکانی وی بکێشی، چای بخۆیەوە ...



دوای هەندێك بێدەنگیی دیسانەوە تێهەڵچوّوە:

- کوڕە زۆر نازداریشە. بەینوبەست لەگەڵ پیرەژنان هەر بەدبەختییە، بەڵام ئەمەنا، ئەمە گەنجە، خۆشبەختی دێنێ!

تفێکی ڕۆکردە سەر زەوی و هەندێك بێ دەنگ بوو و پاشان دەستی پێکردەوە:

- ژن نییە، ئاگرە! ئاگری ئاگران! گەردەنە جوان و نەرمەکەی ...

لەناکاو ستیپان ڕوی بۆ لای وی سوڕاند و پرسی:

- ئەی ئەگەر مرۆڤ هەست بە گوناه بکات؟

- گوناه؟ کام گوناه؟ مرۆڤی هەژار هەرچیەك بکات گوناه نییە!

- مرۆڤی هەژاریش گوناه بکا چارەنوسی هەر سوتانە لە ئاگری دۆزەخ دا ... لە حاڵێکدا کە هەژاریش نیم، من هەژارم؟ نەخێر هەژار نیم.

- پێم بڵێ ئەم کارە چ گوناهێکی تێدایە؟ نە ئەو دەست لە تۆ هەڵدەگرێ، نە تۆش لەو! ئای کە ترسنۆکی!

- بەڵام تۆ دزی و وەك دزان بیردەکەیتەوە ...

سیمیۆن بە ئاه هەڵکێشانەوە گوتی:

- مرۆڤێکی گەمژەیت! هەی گەمژە! خۆشبەختی خۆی هاتوە و بەردەرگای پێگرتوی، تۆش خۆتی لێ نەبان دەکەی! پێدەچێ پارەت زۆر بێ ... دیارە پێویستیت بە پارە نییە ...

- پێویستم پێیەتی بەڵام ...

- تۆ خۆ ناچی پارەی لێ بدزی، خۆی بە هەردو دەستان دەتداتێ. قسەکردن لەگەڵ مرۆڤی گەمژەی لە چەشنی تۆ سودی چییە ... وەك ئەوەیە ئاو لە هاوەن دا بکوتی!

پاشان هەستا و بڕێك خۆی لێك کێشایەوە و درێژەی دایە:

- پەشیمانیش دەبییەوە، بەلاّم وەك دەلّێن: پاشی ترێ خەپشەی برێ. لێرە بەدواوە حەز ناكەم سەروكارم لەگەلّ تۆ دا هەبێ. ئیدی تۆ برای من نیت ، سندانت لێدا! ... بەو ژنە مانگا ئاسایەی خۆت ڕازی بە ...

- مانگا، مەبەستت ماریایە؟

- بەلّێ، ماریا.

- تۆ لە خاكی بەرپێی ماریا كەمتری ... برۆ ونبە لەبەرچاوم!

- هەم بۆ خۆت بە نان و نەوایەك دەگەیشتی، هەم ئێمەش ... گەمژە!

- برۆ ونبە لەبەرچاوم!

- دەڕۆم ... هەق وایە لە بن قامچیان داتڕزێنن!

ئەمەی گوت و پشتی لە ستیپان كرد و بە دەم فیكەلێدانەوە بەرەو لای كوختەكە بۆوە.

نزیكەی دە خولەك دواتر لەو سەوزاییەی تەنیشت ستیپانەوە دەنگی خشەخشێك بەرز بۆوە. ستیپان سەری بەرز كردەوە و ماریای بینی كە بەرەو لای ئەو دەهات. هاتو ساتێك لە شوێنی خۆی چەقی، پاشان لە تەنیشت ستیپانەوە ڕاكشا و بە سرتە گوتی:

- ستیوپا، مەچۆوە! خۆشەویستەكەی دلّم مەچۆوە! لەناوت دەبا! ئەو نەفرەتیە دلّی بەو سەرپەرشتیارە پۆلّەندیەی داناكەوێ و تۆی دەوێ و پێویستی بە تۆیە! مەچۆوە خۆشەویستم!

- برۆ ئەولاوە!

فرمێسكەكانی ماریا چەشنی دلّۆپە بارانی ورد و گەرم ڕژانە سەر ڕوخساری ستیپان.



- ستیپان، مەمفەوتێنە! خۆت گوناهبار مەكە! تەنیا منت خۆش بووێ، مەچۆرە لای كەسی تر! خودا مارەیی منی لە تۆ بڕیوە، كەوایە لەگەلّ مندا بژی. من هەتیوم ... تەنیا تۆم هەیت.

- وازم لێبێنە! شەیتان! پێمگوتی ناچمەوە!

- ڕاستە ... مەرۆ ئازیزەكەم! من باردارم ستیۆپوشكا ... بەم زووانە مندالّم دەبێ ... جێمان مەهێلّە، خودا لە گوناهەكانت نابووری! باوكت و سیمیۆن دەیانەوێ بتنێرنەوە لای ... گوێ بە قسەكانیان مەدە. ئەوانە ئاژەلّن، نەك مرۆڤ!

- بەسە بنو!

- دەنوم، ستیوپا، ئەوە دەنوم.

لەم كاتەدا دەنگی ماكسیم بیسترا:

- ماریا! لەكوێی؟ دایە بانگت دەكا!

ماریا بەپەلە هەستا، قژی خۆی ڕێكخستەوە و بەخێرایی بەرەو لای كوختەكە ڕۆیشت. ماكسیم لەسەرخۆ لە ستیپان نزیك بۆوە. لیباسەكانی دانابوون و لەنێو ئەو ژێركراس و بیجامەیەی كە لەبەریدابوو بە مەیت دەچوو. مانگەشەو بەسەر سەرە لوس و بێ موەكەیەوە سەمای دەكرد و لەچاوە دۆمانەكانیدا تروسكەی دەدایەوە. لە ستیپانی پرسی:

- سبەینێ دەچیتەوە لای خاتون یان دوسبەی؟

ستیپان متەقی نەكرد.

- ئەگەر بڕیارە بچیتەوە، واباشترە سبەی زوو وەڕێكەوی. پێموایە ئەسپەكان پێویستیان بە شۆرین و مشتومالّ هەیە. بیرت نەچێ بەلّێنی پانزە ڕۆبلّی داوە، نەچیتە ژێر باری دە ڕۆبلّەوە.

ستیپان گوتی:

- بەهیچ نرخێك ناچمەوە.

- بۆچی؟

- هەروا ... حەزم لە چوونەوە نییە ...

- بۆچی حەزت لێ نییە؟

- خۆت دەزانی بۆچی!

- ئاوا! ... دەترسێم بەم پیریە ناچارم کەیت پێستی سەرت بگروم!

- بیگرو.

- چۆن بووێری ئەوەت هەیە بەم شێوەیە لەگەڵ بابتدا بدوێی؟ قسە لە قسەی کێ دەکەی؟ بیروهۆشت کۆکەرەوە ... هەتیوە هێشتا دەمی بۆنی شیری خاوی لێ دێ کەچی خەریکە لاملی لە قسەی بابی دەکا!

- مەحاڵە بچمەوە، تەواو! مرۆڤێکی وەك تۆ کە خۆی بە ئەهلی کلیسا دەزانێ دەبێ لە خودا بترسێ و خۆی گوناهبار نەکا.

- من دەمەوێ تۆی گەمژە بە نان و ئاوێك بگەیەنم! کوختەیەکی نوێت بۆ دروستکەم، یان تۆ پێویستیت بە خانو نییە! چ دەڵێی، ها؟ ئاخر کێ ئامادەیە تەختەودار بداتە تۆ؟ کێ پارەت بەقەرز دەداتێ؟ هەر ئەوە کە هەم تەختە و دارت دەداتێ، هەم پارە، ئەویش بەلاش و خۆڕایی!

- من پێویستم بە بەخششی وی نییە.

- ئاخر دەتدەمە بەر قەمچیان.

- بمدە! بمدە بەر قامچیان.

ماکسیم زەردەیەکی کرد و دەستی بۆ پێشێ درێژ کرد. قامچیەکی بەدەستەوە بوو.

- ستیپان دەتدەمە بەر قامچیان.

ستیپان خۆی وەرگێڕایە سەر لایەکەی تری و وا خۆی نیشاندا کە خەوەکەیان لێ تێکداوە.



- ئێستا هەر ناچیەوە؟ دڵنیای ناچیەوە؟

- بەڵێ. خودا بەنەفرەتم کا ئەگەر بچمەوە!

ماکسیم دەستی ڕاوەشاند و ستیپانیش هەستی بە ئازارێکی توند کرد بەسەر شان و گۆنایەوە، وەك شێتان هەستایە سەرپێ و هاواری کرد:

بابەگیان لێم مەدە! لێم مەدە! گوێت لێیە؟ لێم مەدە!

- بۆچی لێت نەدەم؟

ماکسیم ساتێك بیری کردەوە و دو قامچی تریشی ڕاوەشاندێ.

- کاتێ باوکت فەرمانت پێ دەکا دەبێ گوێڕایەڵی بیت! هەتیوە پیسە!

- لێم مەدە بابەگیان! گوێت لێیە؟

ئەمەی گوت و بەدەنگی بەرز کەوتە گریان و بەخێرایی لەسەر کەوڵەکە چۆکی دادا و درێژەی پێدا:

- باشە! دەچمەوە! بەڵام بیرت نەچێ! ... خێر لە ژیانی خۆت نابینی! ئەم ساتە بە نەفرەت دەکەیت!

- زۆرباشە ... بۆ خۆت دەچیەوە، نەك بۆ من ... ئەوە تۆی کە پێویستت بە کوختەخانویەکی نوێیە، نەك من. پێمگوتی لێت دەدەم و لێشمدایت.

- باشە ... دەچمەوە ... بەڵام ئەم قامچییانەت بیر نەچێ!

- پێویست ناکا هەڕەشە و گوڕەشە بکەی! زماندرێژیش مەکە!

- باشە ... دەچمەوە ...

ستیپان لە هاوارکردن کەوت و لەسەرزگ ڕاکشا و بە نەرمی کەوتە گریان.

- دیسان گریایەوە! دیسانەوە دەستی بە زۆڕەزۆڕ کردەوە! هاوارکە! بەیانی زوو وەڕێکەوە. مانگانەی مانگێکت لەپێشەوە وەرگرە. پارەی ئەو چووار ڕۆژەی پێشوشی لێ وەرگرە. ئەو ماکەرەی دایکت دەتوانێ بۆخۆی لەچکێکی پێبکڕێ. دڵگیر مەبە لەو قامچیانەی خواردت، من باوکتم ... ئەگەر حەزم لێ بێ لێت

دەدەم حەزیشم لێ نەبێ لێت نادەم، لەو گوناهەشت دەبوورم ... بەڵێ ... دەی ئەوجار بنو!
پاشان دەستێکی بە ڕیشی خۆی دا هێنا و بەرەو لای کوختەکە چۆوە. ستیپان وا هەستیکرد ئەو ساتەی کە ماکسیمی باوکی چۆوە نێو کوختەکە گووتی: ((بە قامچییان لێمدا)). دەنگی پێکەنینی سیمیۆنی برای بیسترا.
دەنگی ناڵەئاسای پیانۆ لە کوختەکەی باوکە گریگۆری بەرزبۆوە: ژنەکەی باوکە گریگۆری هەموو شەوێ لای دەمژمێر نۆ پیانۆی لێدەدا. ئەودەمە دەنگییێکی سەیر و ئارام بە سەر دێیەکەدا هات. ستیپان هەستا، خۆی بەسەر پەرژینی حەوشەکەدا هەڵدایە ئەودیو و بەرەو ئەوسەری کۆڵانەکە کەوتەڕێ، بەرەو لای ڕوبارەکە ملی نا - ئەو ڕوبارەی کە وەك جیوە دەدرەوشایەوە و ئاسمان و مانگ و ئەستێرەکان تێیدا شەوقیان دەدایەوە - بێدەنگیەکی مەرگبار حوکمڕانی هەموو شوێنێك بوو. تەنانەت گەلاَیەك نەدەلەرییەوە تەنیا ئەوەنەبێ کە جارجار دەنگی وشکی جیڕجیڕەیەك دەهاتە بەرگوێ ... ستیپان لە شوێنێك لە کەنار ڕوبارەکە دانیشت و دەستی نایە بەرچەناکەی. بیرکردنەوەی لێڵ و ناڕون لێکدا لێکدا هورژمیان بۆ مێشکی دێنا و دەیانشێواند.
لەوسەری ڕوبارەکەوە سنەوبەرە بەرز و پتەوەکانی کەنار باخچەکەی ئاغا، سەریان بە ئاسماندا کردبوو. لەنێو دارەکانەوە ئاگرێکی کز لە پەنجەرەی ماڵی ئاغاوە بەدی دەکرا و ورشەورشی بوو. پێدەچوو ئاغاژن هێشتا نەنوستبێ. ستیپان تا ئەو دەمەی کە پەڕەسێلکەکان بەسەر ڕوبارەکەدا کەوتنە فڕین هەروا لەوێ مایەوە و بیری کردەوە. سەرەنجام ئەو کاتەی کە خۆر لەنێو ئاوی ڕوبارەکە تیشکی دایەوە، ئەویش لە شوێنی خۆی هەستا، دەموچاوی شوشت، ڕوو لە ڕوگە نزای کرد، بەهەنگاوی مکوڕ و خێراوە لە کەنار ڕوبارەکەوە بەرەو



تەنکاییەکە ملینا. خولەکێك دواتر، دوای پەڕینەوە لە تەنکاییەکە، بەرەو خانوی ئاغایانە هەنگاوی نا ...

2

بەیانی ئەو ڕۆژە، یلینا یگۆرۆڤنا هەرکە لەخەو هەستا پرسی:
- ستیپان هاتەوە؟
کارەکەرەکە وەڵامی دایەوە:
- بەڵێ، هاتەوە!
ستریلکۆڤا بە زەردەخەنەوە گوتی:
- ها ... شتێکی باشە! ئەی کوا لەکوێیە؟
- لە تەویلەکەیە.
خاتون خێرا لە جێگای خۆی هەستا و بە پەلە لیباسەکانی لەبەرکرد و بۆ کردە ژوری نانخواردن بۆ قاوەخواردنەوە.
ستریلکۆڤا هێشتا گەنج خۆی نیشان دەدا - گەنجتر لە تەمەنی ڕاستەقینەی خۆی. بەهۆی چاوەکانییەوە نەبا هەست بەوە نەدەکرا کە تەمەنی لە سەروی سی ساڵەوەیە و زیاتر لە نیوەی تەمەنی ژنانی تێپەڕکردووە. چاوە کاڵ و قوڵ و بەگومانەکانی زیاتر بە چاوی پیاوان دەچوون . جوان نەبوو بەڵام دەیتوانی ببێتە جێگای ڕەزامەندی پیاوان. ڕوخساری گۆشتن و لەبەردڵان و شاد و - گەردەنی کە سیمیۆن ستایشی کردبوو و زۆری بەدڵ بوو - چەشنی قەدوباڵای جوان و بەشکۆ بوو. ئەگەر هاتبا و سیمیۆن سەری لە جوانی دەست و قاچی ژنان دەرکردبا، بێ گومان سەبارەت بەوانیش شتێکی هەر دەگوت.
ستریلکۆڤا، لیباسێکی سادە و هاوینەی لەبەردابوو، ئارایشی ڕوخساریشی زۆر سادە و ئاسایی بوو. زۆر لەوە تەوەزەلتر بتوانی بتوانێ دەستێك بە سەروڕوی

خۆی دا بێنێ و کاتی خۆی بەوە بکوژێ. ئەو موڵکەی لەسەری دەژیا هی برا گەنجەکەی بوو کە هێشتا ژنی نەهێنابوو و لە پترۆسبۆرگ دەژیا و بەدەگمەن ئەو زەویوزارەی خۆی بیردەکەوتەوە. یلینا یگۆرۆڤنا دوای جیابوونەوەی لە سەرلەشکر ستریلکۆڤ، لە سەر موڵکی ئەو برایەی دەژیا. مێردە بەرێزەکەشی، واتا سەرلەشکر ستریلکۆڤ، لە پترۆسبۆرگ دەژیا و چەند براکەی بیری لە زەویوزارەکەی خۆی دەکردەوە، ئەو لەویش کەمتر هاوسەرەکەی پێشوی خۆی بیردەکەوتەوە. ستریلکۆڤا دوای تێپەڕینی بیست ڕۆژ بەسەر زەماوەندەکەیاندا خیانەتی پێ کرد و دوای ماوەی کەمتر لە ساڵێك لێی جیا ببۆوە.

یلینا هەرکە دانیشتە سەر قاوەخواردنەوە فەرمانیدا ستیپان بهێننە لای.

ستیپان هات و لەبەر دەرگاکەدا ڕاوەستا، ڕەنگپەڕیو و قژئاڵۆسکاو و نیگای لێڵ و گرژ و مۆنی، بە نیگای گورگێکی لە تەڵەکەوتو دەچوو.

خاتون لێی ڕوانی، هەندێك سورهەڵگەڕا و لە کاتێکدا کە خەریکبوو قاوەی بۆ خۆی تێدەکرد گووتی:

- سلاو ستیپان! تکایە پێمبڵێ ئەم هۆقەبازیانە چین وەڕێتخستون؟ بۆ لێرە ڕۆیشتی؟ چووار ڕۆژان کارت کرد و پاشان بێ ئەوەی مۆڵەت وەرگری لێتدا ڕۆیشتی! دەبووایا پێتگوتبام ئەوسا ڕۆیشتبای!

ستیپان لەژێر لێوەوە وەڵامی دایەوە:

- مۆڵەتم وەرگرتبوو.

- لە کێ؟

- لە فلێکس ئادامۆڤیج.

ستریلکۆڤا ماوەیەك بێدەنگ بوو و پاشان گوتی:

- تورە ببووی؟ بۆ وەڵام نادەیەوە؟ دەپرسم: لەمن تورەی؟



- ئەگەر تۆ ئەو قسانەت نەکردبا منیش نەدەڕۆیشتم. کاری من تەنیا پێڕاگەیشتن بە ئەسپەکانە، نەك ...

- وەرە با واز لەو بابەتە بێنین ... تۆ ئەو ڕۆژە لە مەبەستی من نەگەیشتیت ، کەوابێ پێویستی نەدەکرد تورەبیت. من قسەیەکی تایبەتم لەگەڵ تۆدا نەهێنابووە گۆڕێ ... تەنانەت ئەگەر هێنابێتیشمە گۆڕێ و بەلاتەوە نەشیاویش بووبێ نەدەبووایا تۆ ... نەدەبووایا ... ئاخرەکەی هەرچیەکیێ من ... من مافی ئەوەم هەیە هەندێك جار قسەی بەرز و زیادیش بکەم ... هم ... مانگانەکەت بۆ زیاد دەکەم. ئومێدەوارم لەمەولا هیچ چەشنە تێکنەگەیشتێکمان نەیەتە پێش.

ستیپان کشایەوە و ویستی لەژورەکە بچێتە دەرێ.

- پەلەمەکە! مەڕۆ! هێشتا قسەم ماوە! گوێبگرە ستیپان ... ئەو جلوبەرگانەی لەبەرتن بەکەڵکی سوتانیش نایەن، دەستێك جلوبەرگی نوێی تایبەت بە گالیسکەڕانانم بۆ کڕیوی دەبێ لەبەریانکەیت. بە فیۆدۆر دەڵێم بۆتی بێنێ.

- جێبەجێی دەکەم.

- تەماشا ڕوخساری! چیە! هێشتا تورەی؟ بەسە وازبێنە ... من کە ... لەلای من ژیانێکی باشت دەبێ ... هەموو شتێك بەدڵی تۆ دەبێ. تورە مەبە! خۆ زویرنیت؟

- ئێمە کوا هەقی زویربوونمان هەیە خاتون؟

ئەمەی گوت و دەستێکی بادا، چەند جارێك پێڵوەکانی تروکاند و ڕوی خۆی وەرسوڕاند.

- چیە ستیپان؟

- هیچ ... مەگەر ئێمە مافی ئەوەمان هەیە زویر بین؟ نا، نیمانە ..

خاتون هەستایە سەرپێ، بە قیافەیەکی بە ڕوکەش نیگەرانەوە لێی نزیك بۆوە و پرسی:

- ستیپان، تۆ ... چیە خەریکی دەگریت؟
پاشان مەچەکی ستیپانی گرت و درێژەیدایە:
- چیت بەسەر هاتوە ستیپان؟ قسەبکە! کێ ئازاری داوی؟ ...
فرمێسك زایە چاوانی خاتونیشەوە.
ستیپان دیسانەوە دەستی ڕاوەشاندەوە، چەند جارێك پێڵوی لێکدان و بە ناڵین و لەژێر لێوەوە گوتی:
- خاتون ئامادەم خۆشمبووێی ... هەرچیەکی بتەوێ ... ئامادەم! تەنیا ئەوەندە داواکاریەم هەیە: هیچ مەدەرە ئەو نەفرەتییانە! یەك کۆپیك چیە مەیاندەرێ! نە یەك تەڵیشە داریش ... ئامادەی هەموو کارێکم! تەنیا مەرجیشم ئەوەیە هیچ شتێکیان نەدەیتێ!
- هیچ نەدەم بە کێ؟
- بە باوك و براکەم. تەنانەت تەڵیشە دارێکیش! لێیانگەڕێ با لە خەفەتان دیق بکەن و بمرن!
خاتون زەردەیەکی هاتێ، فرمێسکەکانی خۆی سڕینەوە و بە دەنگێکی بەرز پێکەنی و گوتی:
- زۆرباشە. ئێستا فەرمو برۆ . ئێستا لیباسەکانت بۆ دەنێرم.
ستیپان وەدەرکەوت. خاتون، لەدواوە لێی دەڕوانی و چێژی لە سەیرکردنی شانوملە پتەوەکەی وەردەگرت و بیری کردەوە: ((خۆشحاڵم کە گەمژەیە! باشبوو خۆی لەپێش منەوە باسی لە عیشق کرد و منی لەکۆڵ پێشەکی و بەندوباوی دەربڕینی عیشق و خۆشەویستی کردەوە ... )).

ئێواران ئەودەمانەی کە خۆرئاوا دەبێ و ئاسمان ڕەنگی ئەرخەوانی و زەویش ڕەنگێکی زێڕین دەگرێ ئەسپەکانی خاتو ستریلکۆڤا شێتانە بە سەر جادە بێ



کۆتاییەکەی بیاباندا و بەتەنیشت ئاواییدا و ڕوو بە ئاسۆی دوورەدەست دەکەوتنە چووارناڵە ... گالیسکەکە وەك تۆپ هەڵدەبەزیەوە و بێبەزەییانە ئەو چڵە چاودارانەی کە شۆڕابەیان بەسەر جادەکەدا کردبوو، لەژێر پێچکەکانیدا دەپلیشاندەوە. ستیپان لە سەر کوشنی گالیسکەکە دانیشتبوو، بەوپەڕی بێبەزەیی و دڵڕەقیەوە ئەسپەکانی دابووە بەر قامچی و دەتگوت دەیەوێ هەوسارەکانیان پارچە پارچە بکات. دەسڕەنگینی و زەوق و سەلیقەیەکی جوان لە دورینی لیباسە تازەکانی، بەکار هاتبوو. دیاربوو پارە و کاتێکی زۆر بۆ قۆزکردن و جوانتر کردنی وی، تەرخان کرابوو. پارچەی سور و مەخمەری گرانبەها جستەی پتەوی داپۆشی بوو. زنجیرێکی ئەڵقەدار بە سەر سینگیەوە دەبینرا. بۆیاخی ڕاستەقینە وای لە پۆتینەکەی کردبوو تروسکە بداتەوە. کلاوە لێوارداره بە پەڕی تاوس ڕازێنراوەکەی لەگەڵ پەرچەمە کاڵەکەی نەدەهاتەوە. شوێنەواری تەسلیمبوونێکی نەزانانە و لە هەمان کاتیشدا نیشانەی ڕقێکی شێتانە، بەڕوخساریەوە دەبینرا، کە ئەسپەکان باجی ئەم حاڵەتەیان دەدا ... ئێلینا یگۆرۆڤنا کە لەنێو گالیسکەکەدا پاڵیدابۆوە هەوای پاك و خاوێنی دەشتەکەی هەڵدەمژیە نێو سینگە پانەکەی. گۆناکانی چەشنی گۆنای گەنجەکەکان سور هەڵگەڕابوو ... هەستی دەکرد کە چێژ لە ژیان وەردەگرێ و دادوهاواری بوو:
- باشە ستیوپا! لێیدە! لێیدە با لە با خێراتر بڕوا!
لەو خێراییەدا ئەگەر بەردێك بکەوتایەتە ژێر پێچکەکانی گالیسکەکەوە ورد دەبوو یان پڕیشکی لێ دەبۆوە. بەجوتە تا دەهات زیاتر لە ئاوایی دوور دەکەوتنەوە ...
زۆر زوو کوختە خانوەکان و عەمباری ماڵی ئاغا و تەنانەت بوورجی کلیساشیان لەبەرچاوان ون کرد ... سەرەنجام ئاوایی، وەك هێڵێکی تەماویی لێهات و ون بوو. بەڵام ستیپان هەروا ئەسپەکانی دەڕەتاند . حەزیدەکرد خۆی

لەو گوناهە ترسناکە، بپارێزێ. بەڵام نەخێر، گوناهەکە لە ناو گالیسکەکە و لەپشتیەوە دانیشتبوو و سەرەنجامیش نەیتوانی خۆی لە چنگی ڕزگار بکا. ئەو شەوە، ئاسمان و بیابان ، بوون بە گەواهیدەری ئەوەی کە چۆن ستیپان ڕۆحی خۆی دەفرۆشت.

لای دەمژمێر یانزەی شەو، دوبارە ئەسپەکان بەرەو ئاوایی کەوتنەوە چووارناڵە. یەکێکیان دەشەلی و ئەوی تریشیان لمۆزی کەفی دەچڕاند. خاتون لە گۆشەیەکی گالیسکەکەدا بە چاوانی نیمچەداخراوەوە دانیشتوە و خۆی لە ژێر شاڵە پەشمینەکەیدا کز کردبوو. زەردەیەکی ڕەزامەندانە بەسەر لێوەکانییەوە بوو و بەوپەڕی ئارامی و ئاسودەییەوە هەناسەی دەدا. بەڵام ستیپان ئەسپەکانی دەڕەتاند و بیری لەوە دەکردەوە کە دەمرێ. مێشکی وڕ و کاس و دڵیشی لێوانلێو لەژان بوو...

هەموو ڕۆژێ هەرکە ڕۆژدەبۆوە ئەسپە حەساوەکانیان لە تەویلەکە دێنایە دەرێ. ستیپان لە گالیسکەکەی دەبەستن و گالیسکەکەشی لەبەردەم دەرگای باخەکە ڕادەگرت. خاتون بە چاوانی شاد و تروسکەدارەوە لە دەرگای باخەکەوە دەهات و سواری گالیسکەکە دەبوو و ئاژۆتن و ڕەتاندنی شێتانە بەرەو بیابان دەستی پێدەکرد. لە بەختی ڕەشی ستیپانیش شەوێك نەبوو داداتە باران و بەوهۆیەوە لە چنگی ڕۆیشتن بۆ بیابان ڕزگاری بێ.

شەوێکیان دوای گەڕانەوە لە بیابان، لە حەوشەکە هاتە دەرێ و لەکەنارەکەدا کەوتە پیاسەکردن. وەك هەمیشە سەری خاڵی لە ئەندێشە و دڵیشی پڕ لە ژان بوو. ئەو شەوە، شەوێکی ئارام بوو. چەند بۆنێکی خۆش بە هەوادا بڵاو ببوونەوە و ڕوخساریان دەلاواندەوە. کەوتەوە یادی ئاوایی کە لەوسەری ڕوبارەکەوە دیاربوو و ڕەش دەچۆوە. کەوتەوە یادی کوختەکەیان و ئەسپەکەی خۆی و ئەو نیمکێتەی



کە لەگەڵ ماریاکەی خۆیدا پێکەوە لەسەری دەنووستن و ئەو هەموو چێژەی کە وەری دەگرت ... ئازارێکی لە توانابەدەر سینگی پڕ کرد ...

لەم کاتەدا دەنگێکی لاواز هاتە بەرگوێی کە دەیگوت:

- ستیوپا!

ڕووی بەرەو لای دەنگەکە وەرسوڕاند. ماریای بینی کە بەرەو لای ئەو دەهات. ژنە لە تەنکاییەکە پەڕیبۆوە و پێڵاوەکانی بەدەستەوە گرتبوون.

- ستیوپا بۆچی ڕۆیشتی؟

ستیپان بە نیگایەکی خاڵی لە واتا لێی ڕوانی و ڕوی وەرگێڕا.

- ستیوپای خۆشەویستم ، بەتەمای کێ منی هەتیوت بەرەڵا کرد و ڕۆیشتی؟

- وازم لێبێنە!

- بەڵام ئاخر خوا لە گوناهت نابوورێ! لێت خۆشنابێ! بەر لەوەی بتوانی دان بە گوناهەکانتدا بنێی، دەتکوژێ. دواتر ئەم قسەیەی منت بیر دەکەوێتەوە. بیرتە مامە ترۆفیم کە لەگەڵ ژنی سەربازێکدا دەژیا چی بەسەر هات و چۆن مرد؟ خودا مردنی لەو چەشنە بە نسیبی کەس نەکا!

- وازم لێ بێنە! ئاه ...

ستیپان، دو هەنگاو بەرەو لای ماریا چووە پێش.

ماریا، چنگی لە چاکەتەکەی ستیپان گیر کرد و گوتی:

- خۆ من ژنتم! ستیپان! تۆ ناتوانی بەم شێوەیە بەرەڵام کەیت! ستیوپا، خۆشەویستم!

ئەمەی گوت بە دەنگی بەرز دایە پڕمەی گریان.

- ئازیزم، ئامادەم قاپەکانت بشۆم و چڵکاوەکەی بخۆمەوە. وەرە بگەڕێوە ماڵ!

ستیپان هەستا و لە تاو ژان و ئازار و ئەو داخ و خەفەتەی هەیبوو، مستێکی سرەواندە ماریا.

مستەکە بەر زگی ژنە کەوت. دەنگێکی ئازاراوی لە گەروی مارياوە هاتە دەرێ، هەردو دەستی بە زگییەوە گرتن و دانیشتە سەر زەوی و بە نالێنەوە گوتی:
- ئاخ!
ستیپان چەند جارێك پێڵوەکانی لێکدان، مستێکی بە لاسەری خۆیدا کێشا و بێ ئەوەی ئاوڕ لە دوای خۆی بداتەوە بەرەو حەوشەکە ڕۆیشت.
هەرکە گەیشتە تەویلەکە خۆی خستە سەر نیمکێتەکە و سەرینێکی خستە سەر سەری خۆی و بەتوندی گازی لە دەستی خۆی گرت.
لەم کاتەدا، خاتون لە ژوری نووستنی خۆیدا سەرگەرمی فاڵ گرتنەوە بوو: ئاخۆ سبەی دوانیوەڕۆ کەشوهەواکەی خۆش دەبێ یان نا؟ کاغەزەکان هەواڵی کەشوهەوایەکی خۆشییان دەدا.

3

سبەی بەیانی زوو، ڕژۆتسکی لەلای دراوسێیەکیەوە کە بە میوانی چووبووە لای، گەڕایەوە ماڵ. هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو، لای دەمژمێر چواری بەیانی بوو. ڕژۆتسکی شاد و بەکەیف بوو - لەسەر کوشنی گالیسکەکە دانیشتبوو و خۆی گالیسکەکەی لێدەخوڕی و جار جار بە نەرمی بەملاولادا دەهات. ناچاربوو نیوەی ڕێگاکە، بە نێو جەنگەڵەکەدا ببڕێ.
ئەو کاتەی کە خەریکبوو لەو موڵك و زەویوزارەی کە خۆی سەرپەرشتیی دەکرد، نزیك دەبۆوە، بیری کردەوە:
(( نەفرەت لە شەیتان! دەڵێی یەکێك خەریکی داربڕینە!)).
لە شوێنێکی چڕوپڕی جەنگەڵەکە دەنگی تەقەتەقی بەرکەوتنی تەور و شکانی لقوپۆپی درەخت دەهات. گوێی قوڵاخ کرد، هەندێك بیری کردەوە، لە ژێر



لێوەوە جنێوێکی دا، نەزانانە خۆی لە گالیسکەکە فڕێ دایە خوارێ و بەرەو لای دەنگەکە ملینا.
سیمیۆن ژۆرکینی بینی کە بە تەورێکەوە لەسەر زەویەکە دانیشتبوو و دارێکی تەڕی بەردابۆوە و سەرگەرمی بڕینەوەی لق و پۆپەکانی بوو. هەر لەوشوێنە، بەتەنیشتیەوە سێ داری چڵ و پۆپکراوی تۆسکاش کەوتبوون. هەندێك لەولاتریشەوە ئەسپێکی بە گاریەوە بەستراو، سەرگەرمی لەوەڕین بوو. هەرکە سەرپەرشتیار چاوی بە سیمیۆن کەوت مەستیی و خەواڵویی لە سەردا نەما و لە ڕقان سورهەڵگەڕا و بەرەو لای ڕۆیشت و هاواری بەسەردا کرد:
- ئەوە چی دەکەی لێرە، ها؟
هاوارکردنەکەی دەنگی دایەوە و وەڵامی دایەوە: ((ئەو چی دەکەی لێرە، ها؟)).
بەڵام سیمیۆن بێدەنگ بوو، پایپەکەی ئامادە کرد و درێژەی بە کاری خۆی دا.
- چەپەڵ لەتۆ دەپرسم: چی دەکەی لێرە؟
- مەگەر نابینی چ دەکەم؟ خۆ کوێر نەبوویت؟
- چی؟ گوتت چی؟ دوبارەی بکەرەوە.
- گوتم ملی ڕێی خۆت بگرە و بڕۆ!
- چی؟
- گوتم بڕۆ! مەیکە هاتوهاواریش!...
ڕژۆتسکی سورهەڵگەڕا، بە سەرسوڕماویەوە شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:
- ئەمە یانی چی؟ چۆن پڕکێشیی ئەو قسانە دەکەی؟ ...
- بۆ تۆ کێی؟ چی زۆرە شتی وەك تۆ زۆرە! ئەگەر بڕیار بێ پیاو دڵی هەموتان ڕازی بکا هەموو ژیانی بە فیڕۆ دەچێ ...
- چۆن پڕکێشی ئەوەت کردووە ئەم دارە تەڕانە ببڕیتەوە؟ خۆ هی تۆ نین؟

- خۆ هی تۆش نین.
- ڕژۆتسکی قامچییەکەی بە ئاڕاستەی سەروچاوی سیمیۆن بەرز کردەوە بەڵام هەرکە سیمیۆن ئاماژەیەکی بە تەورەکە کرد، پەشیمان بۆوە لە ڕاوەشاندنی.
- چەپەڵ، دەزانی ئەم جەنگەڵە هی کێیە؟
- دەزانم کاکی پۆڵەندی! هی خاتونە، من ڕکابەری لەگەڵ وی دەکەم. تۆ کێی؟ خزمەتکار! نۆکەر! ناتناسم! ڕێی خۆت بگرە و بڕۆ! یاڵڵا دەی ...
پاشان چەند جارێك پاپەکەی کێشا بە تەورەکەدا و زەردەخەنەیەکی تاڵی بۆ سەرپەرشتیار کرد.
ڕژۆتسکی بەرەو لای درێشکەکەی ڕۆیشت و شێتانە بەرەو ئاوایی کەوتە ئاژۆتن. لەوێ چەند کەسێکی بۆ گەواهیدان و بینینی ڕوداوەکە، لەگەڵ خۆی دا هێنان و خێرا گەڕایەوە شوێنی ڕوداوەکە. ئەو کەسانەی ڕژۆتسکی هێنابوونی سیمیۆنیان لە کاتی داربڕین دا، بینی. لە چاوتروکانێکدا کاروباری پێکهێنانی فایل، دەستی پێکرد. کوێخا و جێگرەکەی و کاتب و جوتیار و نوێنەری پۆلیسیش هاتنە شوێنی ڕوداوەکە و ڕاپۆتیان تەواو کرد. ڕژۆتسکیش واژۆی لەسەر کرد، سیمیۆنیشیان - کە هەروا بە تەوسەوە پێدەکەنی - ناچار کرد واژۆی بکا.
بەر لە نانی ئێوارێ، سیمیۆن چووە لای خاتون.
یلینا یگۆرۆڤناشیان لە ڕوداوەکە ئاگادار کردبۆوە. بێ ئەوەی سلاو لە خاتون بکا خۆی بە بێتاوان نیشاندا و گوتی کە تەنیا سێ داری گچکەی بڕیوەتەوە و ئەو کابرا پۆڵەندیە دەیەوێ ماڵی خەڵکی بەقوڕ بگرێ و قسەگەلی لەم بابەتە ...
خاتون بە تۆنێکی تێکەڵ بە ڕقەوە هاواری کرد:
- تۆ چۆن پڕکێشی ئەوە دەکەی داری خەڵکی تر ببڕیەوە؟



سیمیۆن کە کەیفی بەم تورەییەی خاتون هاتبوو، دەیویست بە هەر جۆرێك بووە ئەو سەرپەرشتیارە پۆڵەندیە لەبەر چاوی خاتون سوك و چروك بکا، لەژێر لێوەوە بە بۆڵەبۆڵ گوتی:
- ئەم کابرایە ژیانی لە هەموان هەراسان کردووە! هەر ناوێری قسەیەك بکەی یەکسەر قامچییەکەی بەرز دەکاتەوە! ئاخر چۆن وا دەبێ! کەی ئەمە ڕاستە! بەردەوامیش هەوڵ دەدا قامچییەکەی بکێشێ بە سەروچاوی مرۆڤدا! نا، ئەمە ڕاست نییە! ... خۆ ئێمەش مرۆڤین.
- لەتۆ دەپرسم چۆن پڕکێشی ئەوەت کرد داری خەڵکی تر ببڕیەوە؟
- ئەو درۆی لەگەڵ کردوی خاتون! ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ... بەڵێ، دانی پێدا دەنێم کە چەند دارێکم بڕیەوە ... بەڵام بۆچی ئەو پەلاماری مرۆڤ دەدا؟
خوێنی ئەشرافیانەی خاتون هاتە جۆش و بێ بە هەند گرتنی پەروەردە و بارهاتنی ئەشرافیانەی خۆی و بێ بە هەند گرتنی ئەو ڕێزەی کە بۆ خەڵکی تری دادەنا و بێ ڕەچاو کردنی ئەوەی کە سیمیۆن برای ستیپانە، زللەیەکی کێشا بە بناگوێیدا و بە سەریدا قیژاند:
- بڕۆ ئەو دەموقەپۆزە لادێییانەیەت گومکە لەبەرچاوم! بۆ دەرێ! دەی هەرئێستا بڕۆ دەرێ!
سیمیۆن ساردبۆوە، بە هیچ شێوەیەك چاوەڕوانی شتێکی لەم شێوەیەی نەدەکرد ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی:
- خوداحافیز! دەتوانین چی بکەین!
بە پرتەوبۆڵەوە وەدەرکەوت. تەنانەت تا گەیشتە ناو حەوشەش بیری نەبوو کلاوەکەی بنێتەوە سەری.
یەك دو دەمژمێر دواتر ماکسیم هاتە خزمەت خاتون. چاوانی لێڵ و ڕوخساریشی لە پێشو ڕاکشاوتر و درێژکۆڵەتر دەهاتە بەرچاو. پێیەوە دیاربوو

مەبەستیەتی هەندێك قسەی زبر یان کارێکی چاوقایمانە و بێ شەرمانە بکا.
خاتون پرسی:
- چیت دەوێ؟
- سلاو! هاتومە خزمەتتان داواکارییەکم هەیە. هەندێك تەختە و دارم پێویستە. دەمەوێ کوختەیەك بۆ ستیپان دروست بکەم بەڵام دار و تەختەم نییە.
- چی تێدایە! دەتدەمێ.
ڕوخساری ماکسیم لە خۆشییان گەشایەوە.
- دەمەوێ کوختەیەکی بۆ دروست بکەم بەڵام تەختە و دارم نییە، ڕەوشەکە زۆر خراپە خاتون! وەك دەڵێن هاتم ئاش بخۆم بەڵام ئاش لە گۆڕێ نەبوو! هە هە هە ... هەندێك دار هەندێك تەختە، ... سیمیۆن هاتبووە خزمەتتان بێ شەرمی نواندبوو ... لێی مەگرە خاتون ... ئەو هەتیوە زۆر گەمژەیە. هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو تەمەنەی گەمژەیی لە مێشکی دەرچێ. تێناگا ... کەوابێ دەفەرموی بێم تەختە و دارەکان بەرم؟
- چی تێدایە، وەرە.
- کەوابێ فەرمان بە فلێکس ئەدامۆڤیچ بدە ... خودا تەمەنت درێژکات! ئێستا ئیدی ستیوپکا دەبێتە خاوەن کوختەی خۆی.
- بەڵام ژۆرکین من گران لەسەرتی حیساب دەکەم! هەروەك دەزانی من تەختە و دار نافرۆشم چوونکە خۆم پێویستم پێیانە بەڵام ئەگەر بڕیار بێت بیانفرۆشم ئەوا هەرزانفرۆشیان ناکەم.
ڕوخساری ماکسیم زیاتر کشا.
- واتا چۆن؟
- واتا ئاوا! یەکەم دەسبەجێ پارەم دەوێ، دووەمیش ...
- خۆ من نەمگوت بە کڕین ...



- ئەی بە چی؟
- ڕونە خاتون ... خۆتان باشتر دەزانن ... لەم سەردەمەدا کابرای لادێیی پارەی لە کوێ بوو؟ مشك لە ماڵەکەی کلکی بە ئارد نابێ.
- منیش بەخۆڕایی نایدەم.
ماکسیم کلاوەکەی لە ناولەپیدا گوشی و چاوی بڕیە ساپیتەکە و دوای ماوەیەك بێدەنگیی، پرسی:
- بە گاڵتە واناڵێی خاتون؟
- نەخێر، هیچی ترت نییە بیڵێی؟
- چی بڵێم؟ کە دار و تەختەم نەیدەیتێ چ پێویست دەکا قسە بکەم؟ خواحافیز! دەبووایە تەختە و دارم بدەیتێ ... خۆت پەشیمان دەبییەوە!... ئەوا من ئەو تەختە و دارەم نەویست بەڵام خۆت پەشیمان دەبییەوە ... ستیپان لە تەویلەکەیە؟
- نازانم.
ماکسیم نیگایەکی واتاداری بڕیە خاتون، کۆخەیەکی کرد و هەستا و ڕۆیشت. لە ڕقان سەرتاپای جەستەی دەلەرزی. بەخۆی گوت: (( بۆم دەرکەوتیت سۆزانی )) و بەرەو لای تەویلەکە ڕۆیشت. لەو کاتەشدا ستیپان بە بێ تاقەتییەوە لە تەویلەکە لەسەر نیمکەتێك سەرگەرمی مشتوماڵ و ڕەنك کردنی شانی یەکێك لە ئەسپەکان بوو. ماکسیم بێ ئەوەی بچێتە نێو تەویلەکەوە لە بەردەرگاکە ڕاوەستا و بانگی کرد:
- ستیپان!
ستیپان نە وەڵامی دایەوە، نە سەیری کرد . ئەسپەکە سڵەمیەوە. ماکسیم درێژەی پێدا:
- هەستە بچینەوە ماڵێ!
- نایەمەوە!

- به چ ڕویەکەوە بەم شێوەیە وەڵامی باوکت دەدەیتەوە؟
- دەتوانم بۆیە بەم شێوەیە وەڵامت دەدەمەوە.
- من فەرمانت پێدەکەم!

ستیپان بە خێرایی هەستا و دەرگای تەویلەکەی بە ڕوی ماکسیم دا داخست.
دواتر هەر ئەو شەوە منداڵێك هەواڵی بۆ ستیپان هێنا و پێی گوت کە ماکسیمی بابی ماریای ژنی لە ماڵ دەرکردووە و ماریای داماویش نازانێ شەو لە کوێ ڕۆژ کاتەوە. پێی گوت:
- ئێستا لە بن دیواری کلیساکە دانیشتوە و دەگری، خەڵکی دەورەیان لێ داوە و هەروا جنێوانت بۆ دەنێرن.

بەیانی ڕۆژی دواتر، ئەو دەمەی کە لە خانوی ئاغایانەدا هەموان لە خەوێکی قووڵ دابوون، ستیپان لیباسە کۆنەکانی خۆی دەبەر کردن و چووە ئاوایی. زەنگەکانی کلیسا باوەڕدارانیان بۆ نوێژی بەیان، بانگێشت دەکرد. ئاسمانی ساماڵ و کەشوهەوای هەستبزوێنی ڕۆژی یەکشەممە، هەستی حەزکردن بەژیان و شادمانی، لە ناخی مرۆڤدا دەبزواند! ستیپان بەتەنیشت کلیساکەدا تێپەڕی، نیگایەکی ئازایانەی گرتە کلیسا و بەرەو مەیخانەکە ڕۆیشت. بەدبەختانە دەرگای مەیخانە زووتر دەکرێتەوە لە دەرگای کلیسا. لەگەڵ چوونەژوورەوەدا ئارەقخۆرەکانی بینی کە لەبەردەم مێزەکاندا ڕاوەستابوون. ستیپان فەرمانیدا:
- ڤۆدکا!

ڤۆدکایان بۆ هێنا، ئەوی هەڵقوڕاند و دیسانەوە داوای ڤۆدکای کردەوە. پاشان مەست بوو و ڤۆدکای بۆ هەموویان بانگ کرد. بادەنۆشییەکی پڕ لە دەنگەدەنگ و هاتوهاوار دەستی پێکرد.
سیدۆر پرسی:
- پێدەچێ مانگانەیەکی باش لەو ستریلکۆڤایە وەرگری؟



- وەك خەڵك وەردەگرم. ڤۆدکاکەت بخۆوە ولاغ!
- جارجارە لەم خێراتانە بکە! یەکشەممەت خۆش ستیپان ماکسیمیچ! تۆ چی؟
- منیش ... منیش دەخۆمەوە ...
- زۆر خۆشحاڵم ... ستیپان ماکسیمیچ بەڕاستی ئەمە کارێکی جوانە! بەڵێ ... دەکرێ بپرسم مانگانەکەت دە ڕۆبڵ دەبێ؟
- ها - ها! کوا ئاغایان بە دە ڕۆبڵ بەڕێوە دەچن؟ ئەو سەدیش وەردەگرێ!

ستیپان بەرەو لای دەنگەکە وەرسوڕا و براکەی خۆی، سیمیۆنی بینی کە لە گۆشەیەکی مەیخانەکە لەسەر نیمکەتێك دانیشتبوو و سەرگەرمی ڤۆدکا خواردنەوە بوو. دەموقەپۆزی سەرخۆشانەی مانافۆیلێڤی شماسیش کە زەردەیەکی تەوساوی ئازاردەرانەی بەسەر لێوانەوە بوو، لە پشت سەری سیمیۆنەوە دەبینرا. سیمیۆن کڵاوەکەی لە سەر داگرت و گوتی:
- کاکی بەڕێز مۆڵەتم بدەرێ لە بەڕێزت بپرسم: خاتون ئەسپی باشی هەن یان نا؟ کەیفت بە ئەسپەکانی دێ؟

ستیپان ڤۆدکای بۆ خۆی تێکرد و بە بێدەنگی سەری پێوەنا. سیمیۆن دیسانەوە بەردەوام بوو:
- بە دڵنیاییەوە ئەسپی باشی هەن. بەڵام بەداخەوە گالیسکەڕانی نییە ... خۆ بێ گالیسکەڕانیش ...

مانافۆیلێڤ بەرەو لای ستیپان چوو، سەرێکی بادا و گوتی:
- تۆ ... تۆ بەرازی! بەراز! تۆ لە گوناه ناترسێی؟ ئەی باوەڕدارینە! ئەم پیاوە ترسی لە گوناه کردن نییە! کتێبی پیرۆز چ دەڵێ، ها؟
- دەستم لێ هەڵگرە! گەمژە!

- سەیرکەن بە من دەڵێ ((گەمژە)) ... خۆت زۆر ژیری، ها؟ گالیسکەران
دەبێ لای ئەسپەکانی بێ ... هە - هە - هە ... سەیرکە، ئەی خاتون قاوەت
ناداتیێ؟
ستیپان بتڵە ڤۆدکاکەی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و کێشای بە سەرە زلەکەی
مانافۆیلێڤدا. مانفۆیلێڤ چەند لەترێکی دا، بەڵام درێژەی دایە:
- عیشق! چ هەستێك!... پیف!... بە داخەوە کە لەیەك مارە ناکرێن، ئەگینا
منداڵەکانی ستیپان چ ئاغایەکیان لێ دەردەچوو! ئاغایەلی جدی و خوێندەوار!
هەندێك لە خەڵکەکە لە قاقای پێکەنینیان دا. ستیپان جارێکی تریش بتڵەکەی
کێشایەوە بە سەری دا. ئەمجارەیان چەند لەترێکی دا و کەوتە سەر زەوی.
سیمیۆن لە حاڵێکدا کە هێرشی بۆ براکەی دەبرد، بەسەریدا نەڕاند:
- ئەم شەڕوشۆڕ و ئاژاوەیە چیە دەستت داوەتێ؟ برۆ مارەیکە ئەوجار
شەڕوئاژاوە بنێوە! کوڕینە ئەو شەڕو ئاژاوەیە چیە ناویەتیەوە؟ لەگەڵ تۆمە: ئەم
شەڕەت لەسەر چیە؟
پاشان چاوەکانی بچووك کردنەوە و چنگی لە یەخەی ستیپان گیر کرد و
مستێکی کێشا بە کەلەکەیدا. لەم کاتەدا مانفۆیلێڤیش هەستابۆوە و بەدەم
ڕاوەشاندنی پەنجە درێژەکانییەوە ڕوی کردە ستیپان و هاواری کرد:
- کوڕینە! شەڕە! بە خودا! لێکدانە! لێیدەن!
- بووە هاتوهاوار لە مەیخانەکەدا، هەموان بە دەنگی بەرز کەوتبوونە قسە و
قاقا پێدەکەنین.
لەبەردەم مەیخانەکەدا کۆ ببوونەوە. ستیپان چنگی لە یەخەی مانافۆیلێڤ گیر
کرد و بەرەو لای دەرگاکە فڕێیدا. شماس بە زیقاندنەوە وەك هەڵماتێك بە
پلیکانەکاندا خلۆر بۆوە. دەنگی پێکەنینی خەڵکەکە مەیخانەکەی داگرتبوو.
سیدۆریش خۆی هەڵقورتاندە کارێکەوە کە پەیوەندی بە ویەوە نەبوو و لە ناکاو



مستێکی کێشا بە پشتی ستیپاندا. ستیپان شانی سیمیۆنی گرت و ئەویشی
بەرەو لای دەرگاکە فڕێ دا. سەری بەر چووارچێوەی دەرگاکە کەوت، بە
پلیکانەکاندا چووە خوارەوە و بە ڕوخساری ئارەقاوییەوە کەوتە سەر زەوی.
ستیپان خۆی گەیاندێ و لەسەر زگی کەوتە هەڵپەڕین، شێتانە و بە چێژەوە
لەقەی دەکێشا بە زگی دا و هەڵدەپەڕی ...
زەنگەکانی کلیسا کەوتنە زرینگانەوە، ستیپان سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد
و جگە لە دەموقەپۆزی پێکەنیناوی و یەك لە یەك مەستتر و شادتر، هچی تری
لە دەوروبەری خۆی نەبینی. دەیڕوانییە هەر جێگایەك هەر دەموقەپۆزی بێ
ئەژمار بوو. سیمیۆن بە سەروپرچی ئاڵۆسکاو و ڕوخساری خوێناویی و
مستەکوڵەی نوشتاوە و ڕوخسارێکی تورە و ڕقنەوە، هەوڵی دەدا هەستێتە سەر
پێ. مانافۆیلێڤیش کەوتبووە سەر زەوی و بە چاوانی تۆزاوییەوە هۆڕ هۆڕ
دەگریا.
ستیپان بە بینینی ئەوەی کە لە دەوروبەری دەگوزەرا توشی ترس و تۆقین هات
و وەك شێتان پێی پێوەنا و هەڵات. هەندێك لە خەڵکەکە بە هاوارکردنەوە
کەوتنە دوای:
- بیگرن! پیاوی کوشتوە! بیگرن!
ستیپانی ترساو، بیری کردەوە ئەگەر بیگرن ئەوا بێ شك و گومان دەیکوژن.
بۆیە باشتر پێی پێوەنا.
- بیگرن! بیگرن!
ستیپان بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ کاتێکی زانی گەیشتۆتە ماڵی باوکی. دەرگای
حەوشەکە لەسەرپشت بوو و با، هەردو تاکەکەی دێنا و دەبرد ... ستیپان خۆی
بە حەوشەدا کرد. سێ هەنگاو لەولای دەرگاکەوە، ماریا قۆڵە بێ تواناکانی
بەرداببوونەوە و لە سەر کۆمەڵە پوش و بەردێك قونجی دابۆوە و چاوەکانی

بڕیبوونه زەوییەکە. ستیپان هەرکە ئەوی بینی لە هزر و خەیاڵی مەست و شێواوی دا، ئەندێشەیەکی ڕون پڕشینگی دا ...

دەبێ لەگەڵ ئەم ژنە خۆشەویست و ڕەنگ لێ بڕاو و ڕەنجدیتوەدا لێرە هەڵێن. دەبێ لە دەست ئەم بێبەزەییانە، هەڵێن. هەڵێن بۆ شوێنێکی دوور دووری وەك کۆبان ... بەڵێ، بۆ کۆبان! لە نامەکانی مامە پیوتەر ڕا - ئەگەر مرۆڤ باوەڕ بە نوسینەکانی بکا - دیارە و پێدەچێ ئازادیەکی زیاد لە ئەندازە و چاوەڕواننەکراو لە دەشتەکانی کۆباندا هەبێ. هاوینانی درێژترە و خەڵکەکەشی جەسورترن و ژیانیش لەوێ خۆشترە و ... سەرەتا لەگەڵ ماریادا کرێکاری دەکەن و دواتر پارچە زەویەك بۆ خۆیان دەکڕن. لەوێ نە هەواڵێك لە ماکسیمی سەرلوس و چاو دۆمانە هەیە، نە لە سیمیۆنی مەستیش کە بە پێکەنینەکەی مرۆڤ ئازار بدا.

بەدەم ئەو بیرکردنەوانەوە لە ماریا نزیك بۆوە و لە بەرامبەریدا ڕاوەستا ... سەری بەهۆی مەستییەوە بۆ ڕاگیر نەدەکرا و پەڵەی ڕەنگاوڕەنگ لەبەرچاویدا بەخێرایی دەردەکەوتن و ون دەبوونەوە و لە سەرتاپای جەستەی دا هەستی بە ئازار و ژان دەکرد ... زۆر بە زەحمەت دەیتوانی خۆی بە پێوە بگرێ ... لە حاڵێکدا کە هەستی دەکرد خەریکە زمانی ڕادەوەستێ و چیتر قسەی بۆ ناکرێ، گوتی:

- بۆ کۆبان ... بەڵێ ... بۆ کۆبان ... بۆ لای مامە پیوتەر ... دەیناسی؟ ئەوەی کە نامەی بۆمان دەنوسی ...

بەڵام ... بەڵام ئارەزوی چوون بۆ کۆبان یەکسەر بە بادا چووو ... ماریا نیگای پڕ لە پاڕانەوەی بڕیە ڕوخسارە ڕەنگ لێ بڕاو و ئیبلیسییانە و قژە چڵکنە لەمێژ شانە نەکراوەکەی و لە جێگای خۆی هەستا ... لێوەکانی تەتەڵەیان دەکرد ... بە دەنگێکی بەرز کە بە هاوارکردن دەچوو، گوتی:



- هاتیەوە دزی ملە و دۆلاّن؟ ئەوە تۆی؟ دەڵێی لە مەیخانێ دەموقەپۆزیان بۆ هاڕیوی! نەفرەتیی! بەلاّی گیانی من! ئۆه خوایە لەو دنیا بەو دەردە چیت کە من لەم دنیا چێشتم! منی هەتیوت لەنێو برد و فەوتاندمت!

- بەسە!

- هەی ستەمکارینە! ئێوە بەزەییتان بە بەندەی خوا دا نایەتەوە! ئێوەی دز سیلتان پێ هەڵێنام ... ستیوپکا، تۆ پیاوکوژیت! خودا لە گوناهەکانت نابوورێ! تۆ دەبێ باجی ئەمە بدەیتەوە! دەیبینی! پێتوایە بەس من ئازار دەچێژم؟ نا خەیاڵی وا نەکەیتەوە ... تۆش دەبێ ئازار بچێژی ...

ستیپان چەند جارێك پێڵوەکانی لێکدان و خۆی خڕکردەوە و گوتی:

- بەسە! توخوا بەسە!

- هەی بەدی ئارەقخۆر! دەزانم بە پارەی کێ خۆت مەست کردووە ... دەزانم، هەی دزی ملە و دۆلاّن! لە خۆشییان دەخۆیەوە؟ خۆشت لێ دەگوزەرێ، ها؟

- بەسە چیتر قسە مەکە ماشکا!

- بۆچی هاتوی؟ چیت دەوێ؟ هاتوی لافوگەزاف لێدەی؟ خۆ بێ لافوگەزافیش شتەکە دیارە ... هەمو خەڵکی دەزانن ... نەفرەتی! ...

ستیپان قاچەکانی کوتا بە زەویدا، بەملاولادا دەهات و لە حاڵێکدا کە چاوەکانی بریسکەیان دەداوە بە ئانیشکی پاڵێکی بە ماریاوە نا ...

- قسە دەکەم! دەتەوێ بیکەیتە شەڕ لەگەڵمدا؟ دەتەوێ لێم بدەی؟ باشە، لێم بدە ... لە هەتیوێکی وەك من بدە ... چاوەڕوانی شتێکی لەوە زیاترت لێ ناکرێ ... تۆ و خۆشەویستی؟ لێمدە، دزی بێ مروەت! من بەکەڵکی چی تۆ دێم؟ تۆ خاتونی خۆت هەیە ... دەوڵەمەندە ... جوانە ... منی لادێیی لەکوێ و ئەو ژنە ئەشرافییە لە کوێ؟ ... بۆ لێم نادەیت دزی ملە و دۆلاّن؟

ستیپان دەستی بڵند کرد و بە هەموو توانای مستێکی کێشا بە دەموچاوە ناشیرنبووەکەی دا. لێدانە بەهێزەکەی بەر لاسەری ژنە کەوت. ماریا لەتری دا و بێ ئەوەی نوزەیەکی لە دەم بێتە دەرێ، کەوتە سەر زەوی. لە ساتی بەربوونەوەشی دا  مستێکی تریشی کێشا بە سینگی دا.

پاشان خۆی چەماندەوە بەسەر لاشە بێ گیان و گەرمەکەی ماریادا، نیگایەکی لێڵی برییە ڕوخساری ڕەنج چێشتوی ژنە و بێ ئاگا لەوەی کە ڕویدابوو، بەتەنیشت لاشەکەیەوە دانیشت.

ئیدی خۆر تەواوێك بەرزببۆوە و کەشوهەوای گەرم داهێنابوو. بایەکی گەرمی دەهات. ئەو کاتەی کە حەشیمەتی لەرزۆك ترس لێ نیشتو، دەورەیان لە ستیپان و لاشەی ژنە دا، خەم و پەژارەیەکی دڵتەزێن لەنێو ئەو کەشوهەوا گەرمەدا پەنگی دابۆوە ... خەڵکی بەچاوی خۆیان بینییان و زانییان کەسێك کوژراوە بەلاّم هەرچەندیان دەکرد باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەدەکرد. ستیپان چاوە لێڵەکانی بەسەر حەشیمەتەکەدا دەخشاند، چیرەی ددانەکانی دەهات و قسەی بێ سەرەوبەرەی دەکرد. هیچ کەس نەیدەویست دەست و پێی ببەستێ. سیمیۆن و ماکسیم و مانفۆیلیێڤیش دەنێو حەشیمەتەکە دا ڕاوەستابوون و ڕەنگی مردوانیان لێ نیشتبوو و پرسیاریان دەکرد:

- بۆ کوشتی؟

دایکەش هەرلەوێ دەهاتودەچووو و دەگریا و دەنوزایەوە.

هەواڵەکەیان دایە خاتون. ئاخ و ئۆفی وەڕێخست، دەستی بۆ شوشەی ڕۆحی نیشادرەکە درێژ کرد و خۆی نەخستە سەر ئەو بارە و تەنیا لە ژێر لێوەوە گوتی:

- ئاخ ئەمانە چ میلەتێکن! بەڕاستی میلەتێکی سەیرن! چەپەڵینە! بزانە چیتان بەسەر دێنم! دەبێ بزانن لەگەڵ کێ دا تێکەوتون!



ڕژۆتسکی لە دەرگاوە هات و ویستی دڵی خاتون بداتەوە و توانی سەرکەوتوش بێت و توانی ئەو جێگا و شوێنەی کە خاتونی بەئالۆش لێی وەرگرتبۆوە و دابوویە ستیپان، جارێکی تر وەدەستی بێنێتەوە. ئەم جێگا و شوێنە، زۆر پڕ سود و گەرم و نەرم و گونجاو بوو بۆ ڕژۆتسکی. جێگا و شوێنێك کە ساڵی دە جار لایان دەدا و ساڵی دە جاریش دەیانگەڕاندەوە سەری و خەلاّتێکیان دەدایە، گەرچی شتێکی ئەوتۆ نەبوو.

جگە لە چیرۆکی ئاننا بەگەردەنەوە سەرجەم چیرۆکەکانی تر لەم سەرچاوەیە وەرگیراون: مجموعە اسار چخوف / داستانهای کوتاه / مترجم سروژ استپانیان / انتشارات توس

(* finissez donc! ) بەسە وازبێنە. فەڕەنسی

# كتيَبة ضاثكراوةكانى يانةى قةلَةم
## (2013-2005)

| ز | ناوی کتێب | بابەت | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|---|---|
| 1 | فریوو خۆحەشاردان | چیرۆك | عەتا محەمەد | |
| 2 | ئایین (هزر سیاسەت) | فیکری | کۆمەڵێك نووسەر | یاسین عومەر |
| 3 | بەیەکداکێشانی شارستانێتی | فیکری سیاسی | سامئیل هانتینگتۆن | ئاوات ئەحمەد |
| 4 | سوەیلا | رۆمان | شارام قەوامی | |
| 5 | رۆژی هاتنەکەی عودەی | چیرۆك | ئاوات عەبدوڵڵا | |
| 6 | سیماکانی عەقڵانییەتو خورافە | فیکری سیاسی | فالح عەبدولجەبار | ئاوات ئەحمەد |
| 7 | وەنەوشەکەی چووار شەممان | چیرۆك | کۆمەڵێك نووسەر | شیرین.ك |
| 8 | نەبەهەشت لەسەر زەویدایە | فیکری | کۆمەڵێك نووسەر | ئومێد عوسمان |
| 9 | فیمینیزم | فکری | نورە فەرج المساعد | عەبدوڵڵا تاهیر |
| 10 | لەروانگەی خۆرئاواوە | فکری | کۆمەڵێك نووسەر | ئومێد عوسمان |
| 11 | منداڵباز | رۆمان | فەرهاد پیربال | |
| 12 | کیمیاگەرانی وشە | لێکۆڵینەوەی | کۆمەڵێك نووسەر | یاسین عومەر |
| 13 | گوزارشتی مۆسیقا | هونەری | فواد زەکریا | حەمە کەریم عارف |
| 14 | خەمەکانی رۆشنگەری | فکری | هاشم ساڵح | ئاوات ئەحمەد |
| 15 | یەڵماز گۆنەی | | کۆمەڵێك نووسەر | حەمە کەریم عارف |
| 16 | هەناسەی پێخەفەداخراو | چیرۆك | چنوور سەعیدی | |
| 17 | سادقی هیدایەت | لێکۆڵینەوە | حەمە کەریم عارف | |
| 18 | یادەوەرییەکانی کۆڵانێکی خاپوور | چیرۆك | سیامەند هادی | |
| 19 | قالاو یەعنی قەفەسێکی خاڵی | شیعر | کەمال ئەمینی | |
| 20 | تیانووسی پاشای هیچ | شیعر | یاسین عومەر ئیبراهیم | |
| 21 | لەسێبەری پرسیاردا | دیداری فیکری | سەمەد ئەحمەد | |
| 22 | زەمین وەك پرتەقاڵێك شینە | شیعر | پۆل ئیلوار | فەرهاد پیربال |
| 23 | گێلاسی خوێن | رۆمان | عەتا محەمەد | |
| 24 | حەرامترین | چیرۆك | عەلی پێنجوێنی | |
| 25 | رەنگە کاڵبووەکانی دنیا | شیعر | گەروس عەبدولمەلیکیان | مەریوان هەڵەبجەیی |
| 26 | کۆنترۆڵی میدیا و راگەیاندن | راگەیاندن | نوام چۆمسکی | کەریم قادر پوور |
| 27 | مۆزارت، شمشاڵی ئەفسوناوی | هونەری | ئەنیس مەنسور | مامۆستا ئەحمەد |
| 28 | ئەفرێنەرانی خۆر ئاوا | فکری | هاشم ساڵح | ئومێد عوسمان |
| 29 | دەریایەك لەوشە | دیدار | مهاباد قەرەداغی | |
| 30 | داهێنان و مەرگ | لێکۆڵینەوە | سەلاح حەسەن | |
| 31 | ژنێ لەبەردەم وەرزێکی | ژیان و بەرهەم | فروغ فروغزاد | ئازاد بەرزنجی |



| ز | ناوی کتێب | بابەت | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|---|---|
| 32 | گەڕان بەدوای قولاییدا | چیرۆك | پاتریك زوسکیند | شیرین. ك |
| 33 | پابەندبووین ئەدەبی | لێکۆڵینەوە | رەمەزان لەباح | ئاری عوسمان |
| 34 | مێرووله‌و کۆتر | منداڵن | ئیزۆپ | جەبار سابیر |
| 35 | منو باپیرەو نەنە | منداڵن | ستیوارت همپڵ | جەبار سابیر |
| 36 | دیالۆگ، خەندە، ئازادی | لێکۆڵینەوە | میخائیل باختین | هادی محەمەدی |
| 37 | مامزێر | رۆمان | کاروان کاکەسوور | |
| 38 | ئێمە گوناهین | چیرۆك | هیوا ئەمین نژاد | |
| 39 | شەبەنگی بوون، زایەڵەی.. | راڤەی دەق | هەندرێن | |
| 40 | خۆشم ئەوێی شێتەگیان | منداڵن | ستیوارت همپڵ | جەبار سابیر |
| 41 | فریشتەکان | چیرۆك | رەسوڵ یۆنان | جەبار سابیر |
| 42 | پاییزی عومری من | شیعر | ژاوێن شاڵی | |
| 43 | نەتەوەو حەکایەت | لێکۆڵینەوە | رێبووار سیوەیلی | |
| 44 | گەمەی پاقیژە | شانۆنامە | ژان ژینێ | دلاوەر قەرەداغی |
| 45 | ماجەراکانی سەلمانی فارسی | رۆمان | یوسف عیزەدین | |
| 46 | گەڕانەوەی خوشکەکان | چیرۆك | هەورامان وریا قانع | |
| 47 | تارژەنی رەنگ | حیکایەت | عەتا محەمەد | |
| 48 | ئەوەی دنیا رزگار دەکات جوانییە | کۆدیدار | هیوا قادر | |
| 49 | پیاسەیەك بە تەنیا | وتار و... | توانا ئەمین | |
| 50 | دەروازەیەك بۆ فەلسەفەی.. | فەلسەفی | د.حسێن بەشیریە | رەزا مەنوچەهری |
| 51 | یار لە باخە | شیعر | هیوا قادر | |
| 52 | سوارەکان بە قاچاخ بووك.. | رۆمان | کاروان کاکەسوور | |
| 53 | جیهانی سێیەم و جیهانی مۆدێرن | لێکۆڵینەوە | لوقمان رەئوف | |
| 54 | باران رەدوکەوتووی قەسیدەکانی | شیعر | ئەنوەر رەشید عەولا | |
| 55 | کچی ناو تابلۆکە | چیرۆك | توانا ئەمین | |
| 56 | ڤیسکۆنتی دوولەت بوو | رۆمان | ئیتالۆ کالفینۆ | جەبار سابیر |
| 57 | ئیستاتیکای گێڕانەوە | لێکۆڵینەوە | ئارام سدیق | |
| 58 | چاوەڕوانی | رۆمان | ئارام کاکەی فەلاح | |
| 59 | زێوان | شیعر | سەباح رەنجدەر | |
| 60 | فەهرەست | رۆمان | عەتا محەمەد | |
| 61 | لاییستییە چییە؟ | لێکۆڵینەوە | شیدان وەسیق | فازل مەحمود وەلی |
| 62 | بلیتێك بۆ جەهەنەم | چیرۆك | ئارام کاکەی فەلاح | |
| 63 | مەلەکوت | رۆمان | بەهرام سادقی | سەعید سلێمانی |
| 64 | خواجەنەسرەدین | رۆمان | عەتا محەمەد | |
| 65 | ئۆنتۆلۆجی، بنەڕەتی و بوونی | فەلسەفی | د. محەمەد کەمال | |
| 66 | لە تێکستەوە بۆ مانا | لیکۆڵینەوە | ئارام سدیق | |
| 67 | حیکایەتی عەشقی بی قاف و.. | چیرۆك | مستەفا مەستوور | جەبار سابیر |
| 68 | پەیکەری فەرهاد | رۆمان | عەباس مەعروفی | کەریم قادرپوور |
| 69 | دوا سروودی بەلەمەوانەکان | شیعر | سەعید سلێمانی | |
| 70 | ژماردن | کۆمەڵەچیرۆك | کامیار ئەحمەدی | |
| 71 | گەمژە ئێمە مردووین | مینیماڵ | رەسوول یۆنان | جەبار سابیر |
| 72 | ژن و پیاو و ئاکاری سێکسی | لێکۆینەوە | ویل دۆرانت | دڵشاد خۆشناو |
| 73 | سەردەستەکان | چیرۆك | ماریۆ بارگاس یۆسا | جەبار سابیر |
| 74 | باڵندەکەی من | رۆمان | فەریبا وەفی | حەمە کەریم عارف |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 75 | نامەکانی کافکا و ریلکە | نامەی ئەدەبی | کافکا و ریلکە | غەفوور سالح عەبدوڵڵا |
| 76 | سوارەکانی وشە | چیرۆک | جوتیار ئەحمەد | |
| 77 | دزینی خەونەکان | چیرۆک | ئارام کاکەی فەلاح | |
| 78 | نیگایەك پڕ لە گرفتاری | چیرۆک | فاروق هۆمەر | |
| 79 | سەرگەردانییەکانی پیاوێك | چیرۆک | فاروق هۆمەر | |
| 80 | ئەبی و نابێ رایەکی زمانەوانییە | چیرۆک | محەمەد ئەمین ئەحمەد | |
| 81 | خۆردزین | چیرۆک | محەمەد ئەمین ئەحمەد | |
| 82 | کۆمەڵگەی کوردی پەرەسەندنی | لێکۆڵینەوە | عەتا قەرەداخی | |
| 83 | جەمیلە | رۆمان | جەنگیز ئایتماتۆف | حەمە کەریم عارف |
| 84 | مردنێکی تر | چیرۆک | خۆرخە لویس بۆرخیس | یاسین عومەر |
| 85 | خودا، لەسەری مرۆڤدا | گفتوگۆی فیکری | توانا ئەمین | |
| 86 | دەسپێك لە چیرۆکی کوردیدا | لێکۆڵینەوە | ئارام سدیق | |
| 87 | کتێبی لم | چیرۆک و شیعر | خۆرخە لویس بۆرخیس | مەلوول |
| 88 | نێچیر | رۆمان | کنزا بۆرۆ ئاوێ | جەبار سابیر |
| 89 | تۆم هەبیت... | شیعر | داستان بەرزان | |
| 90 | تاپۆیەك لە تاریکیدا | کۆمەڵە چیرۆك | سەعید سلێمانی | |
| 91 | عەشق لە هەر کوێ بێت | کۆمەڵە چیرۆك | تۆڵستۆی | هیوا خەیات |
| 92 | رۆژێکی تۆزاوی | کۆمەڵە چیرۆك | باران | |
| 93 | فەقێکانی تاریکی | رۆمان | سەلیم بەرەکات | غەفوور سالڕ عەبدوڵڵا |
| 94 | ژان دو لوین | رۆمان | ژاك تۆرنییە | جەبار سابیر |
| 95 | دز و سەگەکان | رۆمان | نەجیب مەحفوز | بەکر دەروێش |
| 96 | مانگی رووی خودا ماچ بکە | رۆمان | مستەفا مەستوور | جەبار سابیر |
| 97 | زێراب و بەیازی گوڵفرۆشێك | کۆمەڵە چیرۆك | ئارام کاکەی فەلاح | |
| 98 | کراسەکەم ببوورە | شیعر | فاتمە فەرهادی | |
| 99 | ئەو پیاوەی سیبەری خۆی فرۆشت | رۆمان | ئادلبر ڤۆن شامیسۆ | حەمە کەریم عارف |
| 100 | سەفەر بە ئەندێشەی پیتدا | لێکۆڵینەوە | ئارام سدیق | |
| 101 | پاکسیما | چیرۆک | سامان کەریم | |
| 102 | کەلتور، تیۆر و چەمکەکان | لێکۆڵینەوە | زەکی ئەلمیلاد، | عەبدوڵڵا مەحمود |
| 103 | پەرجووی سینەما | وتار و گفتوگۆ | کۆمەڵێك نووسەر | ئەکبەر حەسەن |
| 104 | شەیتان و خودا | شانۆنامە | ژان پۆل سارتەر | شۆرش غەفووری |
| 105 | نانی رووت | رۆمان | محەمەد شوکری | د. نەجاتی عەبدوڵڵا |
| 106 | کیمیاگەر | رۆمان | پاولۆ کۆیلۆ | بەرزان عوسمان |
| 107 | ئاشنابوون بە کافکا | لێکۆڵینەوە | پۆڵ سترانێرن | کاروان حەسەن |
| 108 | ئاشنابوون بە بیکێت | لێکۆڵینەوە | پۆڵ سترانێرن | کاروان حەسەن |
| 109 | ئاشنابوون بە جیمز جۆیس | لێکۆڵینەوە | پۆڵ سترانێرن | کاروان حەسەن |
| 110 | ئاشنابوون بە دۆستۆیڤسکی | لێکۆڵینەوە | لیونید گرۆسمان | غەفوور سالڕ عەبدوڵڵا |
| 111 | دادوەر و جەلادەکەی | رۆمان | فریدرخ دورنمانت | کەریم پەرەنگ |
| | من و کامێراکەم | چیرۆک | ئارام کاکەی فەلاح | |
| | بووم بە ژێر رۆژە خێراکانی... | شیعر | داستان بەرزان | |
| | کۆترەکانی باوکم | شیعر | کۆچەر ئەبووبەکر | |
| 115 | تێزی مێژووی تورك | لێکۆڵینەوە | ئیسماعیل بێشکچی | ئەنوەر محەمەد ئەحمەد |
| 116 | ئایدیاڵە سیاسییەکان | لێکۆڵینەوە | برتراند راسڵ | ئەکبەر حەسەن |
| 117 | گوێبگرە با ستران دەچڕێ | چیرۆک و دیدار | هاروکی موراکامی | جەبار سابیر |
| 118 | باوکت لە جەنگە | چیرۆک | کۆمەڵێك نووسەر | هەژار عوسمان |
| 119 | ئەدگار ئالان پۆ | لێکۆڵینەوە | کۆمەڵێك نووسەر | حەمە کەریم عارف |
| 120 | نامەی سەرکردەکان.. | نامەی ئەدەبی | کۆمەڵێك نووسەر | نەبەز گۆران |
| 121 | ئەو نا، گۆدۆیەکی چاوەڕوان | چیرۆک | مستەفا زاهیدی | |
| 122 | قەحپەی 135 کیلۆیی | چیرۆک و دیدار | چارلز بۆکۆفیسکی | شۆڕش غەفوری |
| 123 | مێژووی میتافیزیك | فەلسەفی | راجر هەنکاك | فاتیح سەعیدی |
| 124 | قەرزاربار | رۆمان | کلێر لیتڵفۆرد | بەرزان عوسمان |
| 125 | قاوشی ژمارە 6 | رۆمان | چیخۆف | حەمە کەریم عارف |
| 126 | مۆتەکە | چیرۆک | چیخۆف | ئازاد نەجم |
| | | | | |
| | | | | |